زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی گیرفانی ژمارە (30)

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

## مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە

نووسینی: پیتەر کریستو
وەرگێرانی: شۆڕش جوانرۆیی
بابەت: فەلسەفی
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولرەحمان
هەڵەچن: ناسک عەزیز
تیراژ: 500 دانە
ژمارەی سپاردن : ی 2002



www.sardam.net





## مۆدێرنیتە

### **لە مزگێنییەکانی کۆمەڵگای (مۆدێرنەوە) تا بەدبینییەکانی (پۆست مۆدێرن).**

مۆدێرن بوون چ واتایەکی هەیە؟ سەردەمی مۆدێرن کەی دەستی پێکرد؟ ئایا ئێمە مۆدێرنین؟ لە وەڵامی لافلێدانەکەی (برۆنۆلاتۆر)[1] 1993، پسپۆڕی فەرەنسی کۆمەڵناسی زانست کە ئەڵێ: "ئێمە هەرگیز مۆدێرن نەبووین" دەبێ چی بڵێین؟

هەروەها دەبێ چۆن وەڵامی ئەو کەسانە -کە لەم ساڵانەی دواییدا ژمارەیان یەگجار زۆر بووە- بدەینەوە کە دەڵێن، ئێمە تا ئەم دواییانە لە کۆمەڵگای مۆدێرندا دەژیاین. بەڵام چیدی لەو جۆرە کۆمەڵگەیەدا ناژین. ئەوان لافی ئەوە لێ دەدەن کە ئێمە چووینەتە ناو جیهانی تازەی (پۆست مۆدێرن)[2]ەوە (بۆ نموونە، Lyotard 1979, Jameson 1991, Harvey 1989).

ئـەم پرسـیارانە مێشـکی ژمارەیـەکی زۆر لـە کۆمەڵناسـانی هاوچـەرخی بـە خۆیـەوە سـەرقاڵ کـردووە و، ئەگـەر ئـەوە لەبـەرچاو بگریـن کـە کۆمەڵناسـی بـۆ تێگەیشـتن لـە فـۆرم و نـاوەڕۆکی کۆمەڵگای مۆدێرن هاتە ئاراوە، پێویستە هەر بەو جۆرەش بێت. دامەزرێنە کلاسیکەکانی ئەم بوارە، (کە لە بەشەکانی دووهەم تا چوارهەمی ئەم کتێبە قسـەمان لەسـەر کـرد) –واتـە، مـارکس، فیبـەر و ، دورکـهایم– هـەموو هزرمـەندانی مۆدێرنـەن. تێڕوانینـەکانیان لـە تێگەیشـتنی ئـەو جیهانـە کۆمەڵایەتییـەی کـە تێیـدا دەژیـن سـەبارەت بـە چییەتی کۆمەڵگای مۆدێرن گەلەك پڕ بایەخن. جیا لەوانـەش، بابەتـەکانی سـێ بەشـی پێشـوو هـەرکامیان بـە جیـا لایـەنی گرنـگ و بـارودۆخی مۆدێـرن دەخەنـە ڕوو. کۆمـەڵگای مۆدێـرن لەتـەك پیشەسـازی بـوون و پێشـکەوتنی زانسـت و تـەکنیکدا، بـەدی هـاتووە.. ئامـانج و ئاواتـە دیموکراتییـەکان پەیوەندییـەکی یـەگجار نزیکیـان لەگەڵ مۆدێرنەدا هەیە.





مۆدێرنە بە سەرکەوتنی (تاکخوازی) سەرلەنوێ پەیوەندی تاکەکان لەتەك ئەوانی دی و کۆمەڵەکەیان دروست دەکاتەوە. بەم جۆرە، مۆدێرنە ئاوێتەیەکە لەو شتانەی کە تاوتوێمان کردوون و جیا لەوەش دەتوانین هەریەك لەو سێ تیۆرسێنە کلاسیکە بۆ خستنەڕووی باسێك دەربارەی ئەم بابەتە هەڵبژێرین.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەم ساڵانەی دواییدا بە شێوەیەکی بەرفراوان بۆ توێژەرەوەگەلێك کە حەزیان لە مێژووی کۆمەڵناسییە ئەوە ئاشکرا بووە کە کەسایەتییەکی بەرجەستە بایەخێکی زۆری هەیە لە یارمەتیدانمان بۆ تێگەیشتن لە کەلتوری مۆدێرنە و شێوە جۆراوجۆرەکانی ئەزموونی تاکەکان: ئەویش کۆمەڵناسی ئەڵمانی (جۆرج زیمیل)ە. لەم بەشەدا کارەکانی ئەو (زیمیل) جێی بایەخمان ئەبن.

(داڤید فرازبی)[3] (40 :1984) ئیستدلالی کردووە: "زیمیل یەکەمین کۆمەڵناسی مۆدێرنەیە.. [بەڵگەی ئەم قسەیەش ئەوەیە کە] پێش ئەو هیچ کۆمەڵناسێك هەوڵی نەداوە لە شێوەکانی ئەزموونی

ژیانی مۆدێرن تێبگات" لەگەڵ ئەوەشدا، گەرچی "زیمیل" بە کۆمەڵناسی باڵاتری مۆدێرنە دەناسن، لافێکی دیکەش لێ ئەدرێ کە بە زەمینەسازیان یەکەمین نوێنەری دیدگای کۆمەڵناسی (پۆست مۆدێرن) لە قەڵەم دەدرێ، (Weinstein and weinstein 1993, Bauwan 1992).

پاش هەندێ پێناسەی سەرەتایی سەبارەت بە چەمکە بنەڕەتییەکان و کۆتاییهێنان بە لێدوان لەسەر (زیمیل) دەربارەی کارەکانی خوێندکاری پێشووی ئەو (زیمیل)، واتە (ڕۆبەرت پارک)[4] کۆمەڵناسی ئەمەریکی و کەسایەتی بەرجەستەی قوتابخانەیەك کە بە قوتابخانەی (شیکاگۆ) ناسراو بوو قسە دەکەین. ئەم باسە، ڕێنماییمان دەکات بۆ شرۆڤەکردنی چەمکی (جەدەلی) پۆست مۆدێرنە لەم بەشەدا، تیۆرسینی کۆمەڵایەتی فەڕەنسی (ژان بۆدریار)[5] جێگەی بایەخمان دەبێت. ئەم بەشە بە تاوتوێکردنی چەمکی "سەردەمی مۆدێرنی دواهەمین" کۆتایی دێنین، هەر بەو شێوەیەی کە بەرجەستەترین تیۆرسێنی کۆمەڵایەتی هاوچەرخی بەریتانیا (ئەنتۆنی گیدنز) قسەی لەسەر کردووە.

## مۆدێرنه و پۆست مۆدێرنه:

پێناسەگەلی كاتی: ئەگەر بمانەوێ لە چەمكی ئەم دوو لافلێدانە تێبگەین، دەبێ بزانین كاتێك كە ئاماژە بە فەرهەنگی مۆدێرن و فەرهەنگی پۆست مۆدێرن دەكەین قسە لەسەر چ جۆرە كەلتورێك دەكەین، كەواتە پێش ئەوەی قسە لەسەر (زیمیل) بكەین جێی خۆیەتی ئاماژە بە هەندێ لە پێناسەكان بكەین. ئەوە شتێكی بەڵگەنەویستە كە مۆدێرنە و پۆست مۆدێرن زاراوەگەلێكن كە بە ئاشكرا پێناسەكردنیان سەختە.

زیاتر، مۆدێرنە لە بەرامبەر نەریتدا لەبەرچاو دەگیرێت و نیشاندەری جیابوونەوەیە لە نەریت. (Lyon 1994: 19-21, Touraine 1995). خۆ ئەگەر نەریت بۆ ڕابوردو ئەڕوانێت، ئەوا بە رووكەش مۆدێرنە چاوی لە ئایندەیە.

كەلتووری مۆدێرن بەو جۆرەی كە تیۆرسێنی كۆمەڵایەتی سویدی (گۆران تربۆرن)[6] (4 :1995) قسەی لەسەر دەكات، زیاتر "پەیوەندی هەیە لەگەڵ واژەگەلێكی وەك، پێشكەوتن، پەرەسەندن،





ڕزگـاربوون، ئـازادی، گەشـەکردن، کەڵەکـەبوون، ڕۆشنگەری، چاکبوونەوە و پێشەنگ بوون"دا.

ئەتوانین ئەم خاڵەش زیاد بکەین کە مۆدێرنیزم زیـاتر دیاردەیـەکی بـەربڵاوە و کەواتـە بـە دیاردەیەکی جیهانی وەسف دەکرێت.

پەیوەندیکردن بەم واژانە ئەوە دەردەخات کە کـەلتووری مۆدێـرن لـە گەشـبینی بەرامبـەر تواناکانمان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانمان بە شێوەیەکی گشتی هەروەها سارێژکردنی ئازاری مـرۆڤ و دەوڵەمـەندکردنی ژیـانی کۆمەڵایـەتی بەهرەمەندە. ئەم کەلتوورە، بەر لە هەموو شت تواناکانمان فەرز دەکات بە دەستهێنانی زانست دەربارەی جیهانی سروشتی و جیهانی کۆمەڵایەتی و سـودوەرگرن لـەو زانسـتە بـۆ کۆنـترۆڵکردن و پێکهێنانی ئەو شتانە بە شێوەیەکی بە کەڵك.

تا ڕادەیەك (پۆست مۆدێرنیزم)[7] زاراوەیـەکی تازەیـە. هـەر بـەو شـێوەیەی کـە لـەم واژەییـەدا دەردەکەوێت ئاماژە بە حەساسییەتێکی کەلتووری دەکات کـە وەڵامـە بـۆ مۆدێرنـیزم و لـە ڕووی

زەمەنیشەوە دوای مۆدێرنیزم ڕوودەدات. (Lyotard 1979, smart 1992, Touraine 1995).

لێرەوە کە ئەم زاراوەیە نیشانەی جوڵەیەکە لە کەلتوورێکەوە بۆ کەلتوورێکی دی، کەواتە زاراوەیەکە وەك (بان پیشەسازیخوازی) سەرەڕای ئەوەش، پۆست مۆدێرنیزم جیاوازی هەیە لە تەك بان پیشەسازیخوازیدا، چونکە لە کاتێکدا کە (بان پیشەسازیخوازی)، بە ئاکام و دەرکەوتی کۆمەڵگای پشەسازی لەبەرچاو دەگیرێت، پۆست مۆدێرنیزم نیشانەیەکە لە شرۆڤەکردنی مۆدێرنیزم. ئەگەرچی هەندێ تیۆرسێنی پۆست مۆدێرنیزم ئەم لافلێدانە پەسەند ناکەن، من بە تەواوەتی لەگەڵ (ڕۆبەرت ئانتۆنیۆ)[8] و (دۆگلاس کلێنێر)دا هاوڕام کە نووسیویانە "پۆست مۆدێرنیستەکان دیدگاگەلێکی بەدبینانە لەمەڕ ئەم دەورەیەی ئێستا دەخەنە ڕوو".

بەم جۆرە جولان لە مۆدێرنیتەوە بۆ پۆست مۆدێرنیتە، لە زۆر ڕووەوە گۆڕانە لە گەشبینییەوە بۆ بەدبینی. ئەتوانین ئەمە لە قسەیەکی (بە ڕای من تا ڕادەیەك سەرزەنشت ئامێزی)ی (چارلز





جینگـــن)[9] وه (Harvery 1989: 39) تێبگـــەین کـــە: "پۆست مۆدێرنه له کاتژمێری (3.32) سێ و سی و دووی پــــاش نیـــــوەڕۆی 15ی ژوئیـــــەی 1972 دەستیپێکرد –کاتێك که ئاپارتمانـەکانی (پرۆئیت ئیگـــۆی ســـن لویـــی) بـــە هـــۆی دینامیتـــەوه تەقێنرایـەوه). ئـەم کۆمەڵـە ئاپارتمانـە کـە خـەڵاتی کۆشـك سـازی وەرگرتبـــوو لـــە دەیـــەی پـــەنجادا دروسـتکرا و لــە لایــەن یــەکێك لــە خوێندکـارانی (ئارشـــیتکت)ی مۆدێرنیســـت (لۆکۆبۆزیـــە)[10] نەخشـــەی کێشـــرابوو و گەلـــەك بـــە بـــاڵاتر لـــە ئاپارتمانـــەکانی دی لـــە قەڵـــەم دەدرا. وا تەســـەور ئەکرا که ڕەنگــە ئــەو ئاپارتمانــە کێشــەی هــەژاری گەڕەکە هەژارنشینه کەمینـەکان چارەسەر بکـات و هـەروەها جێگایـەك بـوو کـە لـە ڕووی ئابووریيـەوه ژیانی بنەماڵەگەلێکی هاوڕێك و کۆمەڵێکی چالاك و هاووڵاتیانی بەکەیف و کرێکـارانی بەرهەمهێنـەری ئاسان دەکرد. بە کورتـی دروسـتکردنی (پرۆئیت ئیگـــۆ) لـــە ئـــاوات و خـــەیاڵی مۆدێرنیســـتییەوه ئیلهامی وەرگرتبوو.

پاش کەمتر لە دوو دەیە، ئەم ئاپارتمانانـە لـە لایـەن بنەماڵەگەلێکـەوە داگـیرکران کـە زیـاتر سەرپەرشتیکەریان ژن بوون و لەتـەك هەژارییـەکی هەمیشـەییدا دەستەویەخە بـوون و پێویسـتیان بـە کۆمـەکی ژینگـەپارێزی بـوو، هـەروەها وەك شوێنێکی مەترسیدار و جێگایەك بۆ ئەو کەسانەی کە گیرۆدە بوون بە مادە بێ هۆشکەرەکان و دزەکان و مرۆڤ کوژەکان کەوتـە سـەرزار: بـە جۆرێـك کـە نیشتەجێی ئەو ئاپارتمانانە هەر کە بیانویسـتایە لـەوێ باریـان دەکـردو دەیانگواسـتەوە. (پرۆئیـت ئیگۆ) لە بری ئەوەی کە ببێت بە ڕێگاچارەیەك بۆ گەڕەکە نەدارەکانی نێو شـار بـە پێچەوانـەوە کـەم کـەم وەك کێشـەیەکی (جـدی) دەردەکـەوت. ڕێکخراوی خانووبەرەی خۆجێی کە نەیدەتوانی بیر لە هیچ ڕێگاچارەیەکی کردەیی سەبارەت بە گۆڕانی ئـەو ئاپارتمانـە بکاتـەوە، دەرئـەنجام بـەو ئاکامـە گەیشـت کـە دەبـێ بـڕوخێنێت (یـان ئەگـەر لـە زاراوەیـەك کـەڵك وەربگریـن کـە تیۆرسـینەکانی پۆسـت مۆدێرنیتـە لـە بوارەکـانی دیکـەدا بـەکاری ئەهێنن ئەبێ بڵێین "خاپووریان کرد").





بەم جۆرە چارەنووسی (پرۆئیت ئیگۆ) بە نیشانەیەك لە شكستی گەلاڵەی مۆدێرنیستی و كەواتە بە دەستپێكردنی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم لە قەڵەم درا.

پاش ئەم پێناسە كورت و ئاشكرایە ئێستا بە تیۆرسێنی بالآی سەردەمی مۆدێرن و ڕەنگە پۆست مۆدێرنەوە سەرقاڵ ئەبین واتە: (جۆرج زیمیل).

**میراتی نادیاری جۆرج زیمیل:**

جێگەی (زیمیل) لەنێو بناغەدانەرە بەرجەستەكانی "كۆمەڵ ناسی"دا زۆر كەم پایەدارترە لە جێگەی ماركس، فیبەر و دۆركهایم. ئەو كەمتر لەم سێ كەسایەتیە بەرجەستەیە لەنێو كۆمەڵناساندا ناسراوە. بەرهەمەكانی لەوانەی ئەوان كەمتر دەخوێندرێتەوە و ڕەخنەگرە هاوچەرخەكان، سەرپێچی ەكەن لەوەی بەرهەمەكانی (زیمیل) لەتەك بەرهەمەكانی (ماركس و فیبەر و دۆركهایم)دا، بە بەرامبەر بزانن. ئەو (زیمیل) قوتابخانەیەكی فیكری دانەمەزراند كە





وەچەکانی دواتری کۆمەڵناسان بتوانن بە میرات ببیەن. کەواتە هیچ کۆمەڵناسێکی زیمیلی وەك کۆمەڵناسی مارکسیستی، کۆمەڵناسی فیبەری و کۆمەڵناسی دۆرکهایمی نەهاتە ئاراوە.

کاتێك کە (تالکوت پارسنۆز) چڵك نوسی بەرهەمە گەورەکەی واتە (بنەمای کاری کۆمەڵایەتی) نوسی (1937) بەشێکی بۆ (زیمیل) تەرخان کرد، بەڵام پێش ئەوەی نوسخە دەستنووسەکەی چاپ بکرێت، دووچاری بەدبینی بوو سەبارەت بە گرنگی (زیمیل) و هەر بۆیە ئەو بەشەی لە دەستنووسەکەی لابرد (Jaworks 1997: 45-60).

لەگەڵ ئەوەشدا "زیمیل" لای ژمارەیەکی زۆر لە هاوچەرخانی ڕێزێکی زۆری دەگیرا. بە تایبەت (فیبەر) لەژێر کاریگەری خولقێنەری ئەندێشەی (زیمیل)دا بوو و لە تەقەلادانی بۆ پێشکەوتنی کاری (زیمیل) بەشدار بوو. (دۆرکهایم و تونیس) ڕەخنەیان لە هەندێ لایەنی کارەکانی "زیمیل" دەگرت، بەڵام کارەکانیان بە (جدی) وەردەگرت. لەو سەردەمەدا، (زیمیل) لای ژمارەیەکی زۆر لە





کۆمەڵناسانی بە دە سەلاَتی ئەمەریکی ڕێزی دەگیرا بە تایبەت ئەو کۆمەڵناسانەی کە بە قوتابخانەی کۆمەڵناسی (شیکاگۆ)وە وابەستە بوون.

ئەو بوو بە ڕاوێژکاری سەرنووسەری (گۆڤاری کۆمەڵناسی ئەمەریکا) کە بڵاوکراوەیەکی بەهێزی ئەو قوتابخانەیە بوو و ژمارەیەکی زۆر لە وتارەکانی وەرگێڕدراو لەو گۆڤارەدا چاپ کرا.

**پەراوێزبوونی زانستگایی (گۆشەنشینی زانکۆیی):**

ئەتوانین بەشێك لە هۆکاری پەسەندکردنی کارە تەمومژاوییەکانی (زیمیل) لە بارودۆخی ژیانیا بەدەست بهێنین. ئەو (زیمیل) کە لە ساڵی (1858) لەدایك بوو، کوڕی بازرگانێکی دەوڵەمەندی جولەکە بوو کە بە یەکێك لە شەریکەکانی کارگەیەکی گەلەك سەرکەوتوویی دروستکردنی شیرینی ئەهاتە ئەژمار. باوکی (زیمیل) کە وەك باوکی (مارکس) باوەڕی بە ئاینی مەسیحییەت هێنابوو، هێشتا (زیمیل) مناڵ بوو کۆچی دوایی کرد. پێدەچێت کە پەیوەندی لەگەڵ دایکیا باش نەبووبێت. (زیمیل) لەژێر چاودێریکردنی (ژولیۆس





فریلانــدر) دۆســـتی بنەماڵەکـــەیان و هـــەروەها پەخشـــکەرەوەی (ناشـــر) بەرجەســـتەی بەرهەمـــە مۆســـیقییەکان پـــەروەردە کـــرا. ئاکـــامی ئـــەو پەروەردەکردنەش ئەوە بوو کە ئەگەرچی (زیمیل) لـە تـەواوی ژیانیـا لـە ڕووی مادییـەوە وەزعێکـی باشی هەبوو، بەڵام بە قسەی (لویس کوزەر 194: 1971)، لە "هەستی گۆشەنشینی و نائاسایش ڕەنج و ئـازاری دەکێشـا" گـەرچی (زیمیـل) لەگـەڵ ژمارەیـــەك لـــە بەرجەســـتەترین مامۆســـتایانی زانستگاکانی ئەڵـەماندا (هاوپۆل) بـوو و زۆربـەیان ئـەویان بـە خـاوەن توانایـەکی درەخشـان دەزانـی، بەڵام کۆسپ و گیروگرفت ڕێگەیان لـە پێشکەوتنی کارەکـەی دەگـرت. ئـەو کـە نـەیتوانی کـاری مامۆستایەتی لە زانکۆدا بەدەست بهێنێت، ناچار بوو بۆ ساڵانێکی درێژخایان وەك مامۆستایەك کە (حەقدەست) وەرئـەگرێت بمێنێتـەوە و پێـی ڕازی بێـت، واتـە وەك مامۆسـتایەك کـە موچەکـەی (حەقدەستێك) بوو کە لە لایەن ئەو خوێندکارانەی ئەهاتنە هۆڵی وتاربێژییەکانییەوە کۆئەکرایەوە.





ئاشـــکراکردنی هـــەموو هۆکارەکـــانی ئـــەو بارودۆخـــە کـــارێکی دژوارە. ڕەنگـــە بەشـــێك لـــە مەســـەلەکە ئـــەوە بێـــت کـــە (زیمیـــل) نکوڵـــی لـــە مامۆستاکانی دەکرد و ڕووبەڕوویان دەبۆوە، شتێك کە هەرگیز ئەوان لە خوێندکارەکانی تردا بەدیان نەدەکرد. بەشێکی دیکەی مەسەلەکە ڕەنگـە لـە چیـەتی خـەیاڵاویی و نـاکردەیی مەیلەکانییـەوە سـەرچاوەی گرتبێـت بـۆ نموونـە، سـاڵی (1880) وتـارێکی بـە نـاوی "هـەندێ خوێندنـەوەی دەروونناسـی و مرۆڤناسـی دەربـارەی مۆسـیقا" نوسـی. بەشـێك لـەم لێکۆڵینەوەیـەی بـە (yodeling) تـەرخان کرابـوو. باسـەکەی بـە هـۆی ئـەوەی لـە دیدگای مامۆستاکانیەوە بە خواستێکی نائاسایی لـە قەڵـەم درا، ڕەتکرایـەوە هـەر بۆیـە ناچـار بـوو باسێك سەبارەت بە بابەتێکی دی بنووسێت.

لەگەڵ ئەوەشدا بە زۆری لەنێو هۆکارگەلێکدا کە لە سیستمی زانکۆیی ئەڵەماندا ڕێی لە پێشکەوتنی دەگـــرت دژە جولەکەگـــەری لـــە هـــەموویان بەرجەستەتر بوو.





بەڵگەگـەلێکی زۆر هەیـە کـە ئـەوە دەردەخـات ئەسلْ و نەسەبی جولەکەیی (زیمیل) ائەو جولەکە نەبوو کە پەیڕەوی ڕاسپاردە مەزهەبییـەکان بکات، لە لایەکی ترەوە ڕێوڕەسمی چوونـە سـەر مەزهـەبی (لۆتـــەر)یـــان بـــۆ بـــەڕێوە بردبـــوو ا بەڵگەیـــەکی ئاڕاسـتەکراوە بـۆ بێبەشـکردنی لـە پیشـەگەلێکی جۆراوجۆری زانکۆیی، هەرچەند وا دەردەکەوت کە بە تـەواوەتی شایستـەیی وەرگرتنـی ئـەو کارانـەی هەبێت. وا دەردەکەویَ (زیمیل) لانـی کـەم ماوەیـەك هـــاتوچۆی کـــۆڕە سۆشیالیســـتەکانی کردبێـــت و ڕەنگـە ئـەم هاودەردییـە سیاسـییەی کاریگـەری لەسەر ئەو مەسەلە دانابێت.

مەسـەلەیەکی دیکـەش کـە ڕەنگـە کێشـەکانی زیـاتر کردبێـت ئەوەیـە کـە مامۆسـتاکان بـە هـۆی سەرکەوتوویی لەسەر سـەکۆی وتـاربێژی ئێرەییـان پیَ دەبرد. ئەو، وتاربێژێکی کارامە و بـەتوانا بووو سـەرنجی ژمارەیـەکی زۆر لـە خوێنـدکـارانی بـەرەو لای خـۆی ڕائەکێشا. جیا لـەوەش مۆڵـەتی بە کچـە خوێندکارەکـــانی دەدا بـــۆ ئامادەبوونیـــان لـــە سـوخنرانیەکاندا بـەر لـەو کاتـەی کـە امۆڵـەت

درابوون] وەك خوێندكارێكی هەمیشەیی بچنە ناو زانكۆكانی (پروس)ەوە و كۆبوونەوەی ڕووبەڕووی بۆ فەراهەم دەكردن، سەرەڕای ئەوانەش ئەو خوێندكارانەی كە سەرنجی ڕادەكێشان كەسانێك بوون كە خاوەن پلەوپایە موحافیزەكارەكانی زانكۆ لێیان ڕازی نەبوون، چونكە لە ڕیزی ناڕەزایانی سیاسی مۆدیرنخوازانی كەلتووری و خوێندكارانی ئەوروپای خۆرهەڵاتدا بوون كە لە ڕووی ڕەگەزەوە بە نزمتر (كەمتر) لە قەڵەم دەدران (Frisby 1984: 27).

دەرئەنجامی ئەوانە (زیمیل) تا ڕادەیەك تا كۆتایی ژیانی لە (بەرلین)دا مایەوە كە بە ناوەندی فەرهەنگی و سیاسی ئەڵەمان و پایتەختێكی گەلەك بزۆز و چالاك لە قەڵەم دەدرا. لە تەمەنی 56 ساڵیدا كاتێك كە سەرئەنجام لە زانكۆی (ئستراسبۆرگ)دا كورسی زانكۆیی بەدەست هێنا بەنابەدڵی بەرلینی جێهێشت. چوونی ئەو بۆ (ئستراسبۆرگ) هاوكات بوو لەتەك یەكەمین جەنگی جیهانیدا. (زیمیل) لەو شوێنە تازەیەدا بە سەرسوڕمانێكی زۆرەوە گۆڕا بە ناسیونالیستێكی پڕ شۆڕ. بە درێژەكێشانی شەڕ هەرچی زیاتر بێهیواو دڵسارد بۆوە و ئەم

مەسەلەیە هەستی پەراوێزنشینی و دابڕانی لە ژینگەی تازەی زانکۆیی زیاتر کرد. (زیمیل) ژیانی خۆی لە (ئستراسبۆرگ)دا وەك ژیان لە کڵێسەدا وەسف دەکرد، چونکە ژیانی "پەراوێزنشینانەی" هەبوو- و تاکاتی مردنی لە ساڵی 1918دا، وەك بێگانە و زانکۆییەکی پەراوێزنشین مایەوە (Frisby 1981: 32).

## زیمیل: دەربارەی کەلتووری مۆدێرنیتە:

ئەندێشەی (زیمیل) کۆمەڵناسی کەلتووری مۆدێرن، بە زۆری ڕەنگدانەوەی ئەو شتەیە کە ئەو بە تایبەتمەندی ئەسڵی دەستنیشانکردنی مۆدێرنیتەی دەزانێت -واتە چیەتی چەند پارچەی ئەو. (زیمیل) کە لە بنەڕەتدا بە وتارنووس ناسراو بوو لە نووسینەکانیا بە وەسفگەلێکی ورد و جوان، یان هەندێ وێنا لە گرووپە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان وەك نامۆ، ڕژد و، سەرچڵ، یان جۆرەها کرداری بەرامبەری کۆمەڵایەتی وەك ئاڵوگۆڕکردن، بەربەرەکانی و (پێکەوە ژیانی)[11]





بەکار دەبرد. ئەو بابەتگەلێکی دەخستە ڕوو کە بە شـــێوەیەکی بـــاو بـــە شـــتانی کۆمەڵناســـی نـەدەژمێردران وەك ئـەوەی کـە بـەهای جوانناسـی گوڵدانێك چی بەسـەر دێت ئەگـەر دەسـکێکی –کـە خەسڵەتی قازانج لەخۆ دەگرێت– پیّ زیاد بکرێت.

ڕەوشی (زیمیل) ڕەوشی تێڕوانینێکی بێبایەخ و بێلایـەن بـوو. وا دەردەکـەویّ ئـەو بـە پێچەوانـەی (مــارکس) یــان (دۆرکــهایم) حــەزی نــەکردبێت ڕێگاگـەلێك بـۆ گۆڕانـی جیـهان بدۆزێتـەوە. ئـەو قسەی لەسەر تراژیدیای کەلتووری مۆدێرن دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئـەوەی لـەحنێکی ڕەخنەگرانـەی هـەبوو وەك (فیبەر) و هاوچەرخانی دیکەی بەدبین نەبوو.

جێــی سەرســوڕمان نییــە کــە (ئــەو) بــە کۆمەڵناسێکی بەرداشت گەر و ئاسودەخواز وەسف کـراوە کـە وێناگـەلێکی وردبینانـە لـە دیمـەنێکی تێپــەڕ بــە دەســتەوە دەدات و بــەڵام دیدێکــی هەمەلایەنەی لەمەڕ گشتییەتی کۆمەڵایەتی نییە.

**(Frisby 1981: 68-101, Weinstien and weinstien 1993: Levine. 1995, Axelord 1997).**

لەگــەڵ ئەوەشــدا، ڕاڤــەکارانی (زیمیــل) لــەم واقعییەتە بە ئاگان کە لەژێر ئەم بەش و پارچانەی





لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون لە ژیانی کۆمەڵایەتی هاوچەرخدا چوارچێوەیەکی تیۆری ئاشکرا و هاوڕێك (منسجم) هەیە. من بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستییە لە دوو بابەتی گرنگی نووسینەکانی (زیمیل) دەکۆڵمەوە: یەکەم بابەت (پارە)یە چونکە (زیمیل) پێی وایە کەلتووری مۆدێرن پشت ئەستوورە بە سیستمی ئابووری کە لەسەر بناغەی (پارە) ڕاوەستاوە. بابەتی دووهەم (شارە)، چونکە (زیمیل) پایتەختی مۆدێرنی بە شوێنێك دەزانی کە تیایدا کەلتوری هاوچەرخ لە یەکەمین و هەروەها کامڵترین فۆرمی شیاودا دەردەکەوێت.

### فەلسەفەی پارە:

(زیمیل) تیۆرسینێکی سیستماتیك نەبوو، بەڵام کتێبە گرنگ و ئاڵۆزەکەی واتە، (فەلسەفەی پارە)[12] (1907) هاوڕێکترین هەڵسەنگاندنی سەبارەت بە فۆرم و ناوەڕۆکی کەلتووری مۆدێرن لەخۆ گرتووەو بوو بە چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ نووسینەکانی دواتری. (زیمیل) لە هەواڵێکدا کە بۆ





پرۆپاگەندەی کتێبە تازەکەی بڵاوی کردەوە (ئەم کارە لەو سەردەمەدا باو بوو). مەبەستی خۆی لە نووسینی ئەم کتێبە بە فەراهەمکردنی تەواوی بەسەر ماتریالیزمی مێژووییدا ڕاگەیاند. ئەو لەبری ئەوەی وەك (مارکس) سەرنجی بارودۆخی (مادی) بدات –فاکتەری ئابووری– کە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی ئابووری پارە (دراو). لە بنەڕەتدا حەزی بە دەستنیشانکردنی ئەو شێوە جۆراوجۆرانە دەکرد کە بە هۆی ئەوانەوە کۆمەڵگایەکی بونیاتنراو لەسەر ئابووری پارەی کەلتوور و کەواتە پەیوەندی تاك لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ئەگۆڕێت (Poggi 1993: 62-8). (زیمیل) هەوڵی دەدا دەروونناسی کۆمەڵایەتی تایبەت بە ئابووری پارە (دراو) دەستنیشان بکات و هەروەها ئەو شێوە جۆراوجۆرانە وەسف بکات کە ئەم دەروونناسییە کۆمەڵایەتییە بە پاڵپشتی ئەوان (ژیانی ناوەکی و دەرەکی)مان ڕێکوپێك دەکات (Kracauer 1995: 250).

(زیمیل) [(1907) 1991: 210] ئەوەش دێنێتەوە یاد کە پارە خۆی لە خۆیدا هیچ بەهایەکی نییە بەڵکو





ئامرازێکـه بـۆ ئاسـانکردنی ئـاڵوگۆڕی کاڵاکـان و خزمەتگوزارییـــــەکان. پــــارە ئــــامرازێکی (ئەبسـتراکت)[13] و (ناشەخسـی)[14]یـە. لـە ڕاسـتیدا شتێك نییە لەوە زیاتر کە ئامرازێکە بۆ گەیشتن بـە ئامانج. کەواتە پارە لایەنگیری عەقڵانی بەرامبەر بە جیهان فراوانتر دەکات و لێرەوە باسـەکەی (زیمیـل) هەم لەگەڵ تیۆری (مارکس) و هەم لەتەك (فیبـەر)دا وێکچوونێکی ئاشکرای هەیـە. بەڵام (زیمیـل) ئـەوە زیاد دەکات کە ڕەنگە ئـەم عەقڵانییەتـە لای هـەندێ کـەس تـەحریف بکـرێ کـە پـارە لـە خۆیـدا بـە شـــــێوەیەکی ناعــــــەقڵانی وەك ئامــــــانجێك لەبەرچاو دەگرن.

بۆ نموونە بەرچاو تـەنگ، یـەك ئەسڵ (بنـەها)ی کۆمەڵایەتییەکـە "بەختـەوەری تەنـها لـە هــەبوونی پارەدا دەبینێت بێئەوەی کە سەرقاڵی موڵکایەتی و بەهرەمـەند بوون لـە شـتومەکە تایبەتییـەکان بێـت" (زیمیـل 179: 1971). لەگـەڵ ئەوەشـدا، لای کەسـێکی دەســتبلاو "جەزابیـــەتی کـــاتی هەڵســـەنگاندنی عـەقڵانی پـارە یـان کـاڵا دەخاتـە ژێـر کاریگـەری خۆیەوە". (Simmel 1971: 182).





پـــارە، بـــە جیاکردنـــەوەی دەرگیرییـــە سۆزدارییەکان لـە مامەڵـە ئابوورییـەکاندا، ژمـارەی بەشداربووانی کڕین و فرۆشتن دەستەبەر دەکاتو ئازادی تاك بە پچڕاندنی پەیوەندییە بەرفراوانـەکان لـە بەرامبـەر گروپـی یەکـەمیندا (وەك خـێزان، یـان خێڵ) زیاتر دەکات، بەم جۆرە پـەرە بـە جیهانبینی تاکخوازانە ئەدات. پارە تاك بەرەو خواستی ئایندە هان دەدات –بە تێڕوانین لە جیهان بـە پێـی تـازەیی و زوو تێپـــەڕینی– و کەواتـــە ڕێزگرتـــن و خۆشەویستی پەیوەندی خزمایەتی ناهێڵێت.

تـەواوی ئـەم مەسـەلانە ئـازادی بەخشـن بـەڵام (زیمیـل) لایـەنی نێگـەتیڤی پـارەش لەبـەرچاو دەگرێت.

پارە لەنێو خەڵکیدا بەربەستێك دەهێنێتە ئاراوە و پلـە بە پلـە جێگـەی بەهایـەکی ڕەهـا دەگرێتـەوە. ئەو زیاتر جـەخت دەکـات و دەنووسـێت "تـەواوی بێبـەزەیی پارە لـەناو کـەلتووری کۆمەڵگـەدا ڕەنـگ دەداتـەوە کـەلتوورێك کـە پـارە دەسـت نیشـانی دەکات (Simmel [1907] 1991: 344).





بەم جۆرە وا دەردەکەوێت کە جیهان بە شێوەیەکی ساردو بێ ڕۆح و ئامێری کاردەکات، هەڵبەتە بەو فەرزە پاڵەکییەی (ضمنی) کە ڕەنگە بەبێ ڕەچاوکردنی بەهاکان، باوەڕەکان و لایەنگیری عاتیفی کەسانێك کە کۆمەڵگا پێك دەهێنن، جیهانی کۆمەڵایەتی ڕێك بخەین و نەزمی پێ بدەین. بە کورتی زیمیل (1991 [1907]) ئەم کاراکتەری عەقڵ خوازانەی ژیانی کۆمەڵایەتی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

بە گشتی، دەتوانین کارکردگەلێکی ئەندێشمەندانەی کە لە ئێستادا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەتەك جیهان و بۆ ڕێکخستنی ڕەفتارگەلی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی کەڵکیان لێ وەردەگیرێ بە کارکردگەلێکی (حسابگەرانە) لە قەڵەم بدەین. ئامانجی ناسینی ئەوانە بریتیە لە وێناکردنی جیهان وەك مەسەلەیەکی گەورەی (حساب) و هەروەها تەسەورکردنی ڕووداوەکان و جیاوازی چلۆنایەتی شتومەکەکان بە شێوەی کۆمەڵێك ژمارە (لاپەڕە 44–443).





## جیاوازی کۆمەڵایەتی لە (پایتەخت)دا

(زیمیل) وەك (دۆرکهایم) مەیلی لە دیاردەی جیاوازی کۆمەڵایەتی بوو و بە پێچەوانەی (دورکهایم)ەوە کە زیاتر سەرنجی دابەشکردنی کاری دەدا، ئەو مەیلی بە شێوەکانی دەسەڵاتی جیاوازی کۆمەڵایەتی بوو لە تەواوی لایەنەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ڕۆژانەدا. ئەو دەیوت لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا تاکەکان شوناسی خۆیان لە "گروپ"ەوە وەردەگرت و لەم ڕووەوە گەلەك گردبوون. ئەم بارودۆخە لە ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا بە هۆی هەبوونی دامەزراوگەلێکی میانڕەوەوە وەك سەندیکا پیشەییەکان کە وەك بەربەستێك لە نێوان تاك و کۆمەڵگادا کاریان دەکرد، گۆڕا.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم مەسەلەیە بە هۆی تاکە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگاوە نایەکسانیەکی زیاتری دەهێنایە ئاراوە، بەڵام هەستی شوناسی تاك هەنووکە تا ڕادەیەکی زۆر لەتەك شوناسگەلی تایبەتی گروپەکاندا، دیار یدەکرا.





جیــهانی مۆدێــرن ئــەم پەیوەندییانــەی بــە شێوەیەکی بڕاوەیی (قطعی) گۆڕی. (زیمیل) حەزی دەکرد بـە کـەڵکوەرگرتن لـە خـوازە ئەندازەییـەکان وەسـفی ژیـانی کۆمەڵایـەتی بکـات و لـەم ڕووەوە زیـاتر دەربـارەی وابەسـتەییە گروپییـەکان، واتـە کۆڕە کۆمەڵایەتییەکان قسەی دەکرد.

بـە پێچەوانــەی جیــهانی پێــش مۆدێرنــەوە، کۆمـەڵگای مۆدێـرن خـۆی لـە خۆیـدا فرەچەشـنییە بـەو مانایـەی کـە تاکـەکان لـە خـاڵی لێکجـودا و کۆڕگەلی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتیدا ئەژین.

هــەرکام لــەم کــۆڕە جۆراوجۆرانــە بەشــێك لــە زەمــان، وزە و دەربەســتی تــاك داگــیر دەکــەن و وابەســتەییە جۆراوجۆرەکــان کــەم تــا زۆر لەگــەڵ وابەستەییەکانی دیکەدا سازگارن. لەم ژینگەیەدا، کۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کە (تاك) بە ویستی خۆی بۆ بەشـداریکردن هـەڵیان دەبژێرێـت، سـەربەخۆیی و نادۆگماییەکی زۆری لە گفتوگۆدا دەربارەی ئەرکە جۆراوجۆرەکـــانی وەفـــاداری پـــێ دەدات (Simmel [1908] 1995).





یەکێك لەو گۆڕانکارییە گرنگانەی کە ڕوودەدات لە ئاکامی ئەو (تانوپۆ وابەستەییە گروپی)[15] یە ئاڵۆزەوە کە (تاك) گرفتار دەکات، ئەوەیە کە بەشگەلێك لە ژیانی (تاك) لەبەرچاوی ئەندامانی ئەو گروپە جۆراوجۆرانەی کە (تاك) تیایاندا بەشداری دەکات شاراوەتەوە. دەرەئەنجامی تەواوی ئەوانە ئەوە نییە کە جیاوازی نێوان قەڵەمڕەوی گشتیو تایبەتی بەرجەستەتر ئەبێت، بەڵکو لەوانەیە دونیای دەروونی تاك نهێنیگەلێکی تیا بێت کە تەنانەت بۆ نزیکترین ئاشناو دۆستەکانیشی ئاشکرا نەبێت.

(زیمیل) حەزی لەو کەشوهەوایە بوو کە تیایدا ژیانی مۆدێرن ڕووی دەدا و هەر بەم هۆیەوە بە تایبەت حەزی لە شار بوو، چونکە لە ڕاستیدا کۆمەڵگای مۆدێرن لە (پایتەخت)دا دروست بوو و بەقووڵترین و بنچینەییترین شێوە لەوێدا تەکامولی کرد. (زیمیل) یەکەمین کۆمەڵناسی ژیانی شاری مۆدێرن بوو هەرچەند هاوچەرخەکانی تری وەك (فیبەر) و زانای فەڕەنسی (فوستل دوکولانژ)[16] بە

شـــێوەیەکی وردبینانـــە ســـەبارەت بـــە شـــار بابەتگەلێکیان نووسیبوو.

بە سـەرنجدان لـە ژیاننامـەی زیمیـل نابـێ ئـەم مەلەسـەیە هێنـدە سەرسـوڕهێنەر بێـت، چونکـە (زیمیل) ساڵە سـەرەتاییەکانی ژیانی لـە نـاوەندی (بەرلین)دا بەسەر برد لە چوار ڕایەکی بازرگانی کە بە گۆڕەپانی (تایمز)ی نیویـۆرك بـەراورد کـراوە و تەواوی ژیانی جگە لە چوار ساڵی کۆتایی تەمەنی لە (بەرلین) ژیا کە شارێکی بزۆز بوو ڕۆژ بە ڕۆژیش بە خێرایی گەشەی دەکرد (Frisby 1992: 99, coser 1972: 194).

لەمـــەوە کـــە ئـــابووری پـــارەیی (دراوی) بـــۆ پێکـهێنانی فەرهـــەنگی مۆدێـــرن ڕۆڵێکـــی بـــاڵای هەبوو، هەروەها لەوکاتەدا کە ئابووری پارەیی لە پایتەختدا تا ڕادەیەك دەستی کرد بە پەرەسەندن، لە شاردا بوو کە (تـاك) ئـەیتوانی چـاوەڕێ بکـات کەلتووری مۆدێرن لە ئاشکراترین شێوەی خۆیـدا ببینێـت. (زیمیـل) لـە وتـارێکدا لـەژێر نـاوی "پایتـەخت و ژیـانی ڕەوانـی"[17] (زیمیـل 1903) کـە چوار ساڵ بەر لە بڵاوبوونەوەی"فەلسەفەی پارە"





[زیمیل (1907)] بڵاوکرایەوە، کاریگەرێتی کەلتووری مۆدێرنـــی لەســـەر دەروونناســـی کۆمەڵایـــەتی شارنشینان هەڵسەنگاندووە.

لەم وتارەدا خوێنەر هەست بە ڕەنگدانەوەی ئەو بابەتانـــە دەکـــات کـــە (دورکـــهایم) و (فیبـــەر) خستوویانەتە ڕوو. بـۆ نموونـە، (زیمیـل) بابـەتی (دورکـــهایم)ی دەخاتـــەڕوو کـــە بریتییـــە لـــە پەرەسەندنی وابەستەیی بەرامبـەر لـە کۆمـەڵگادا. ئەو لەتەک (دۆرکهایم)دا هاوڕا بوو کە ئەم مەسەلەیە تا ڕادەیـەکی زۆر سـەرچاوەی لـە خـێرایی پێـوەری پسپۆڕی کارەوە وەرگرتووە، بەڵام لەو بڕوایەدا بوو پێویستی جۆرەها هاوئاهەنگی ئـاڵۆزیش لـە تـەك توند بوون و ئاڵۆزبوونی ژیانی شاردا دەرکەوتووە. (زیمیل) (1328: 1971) بیری لەو ئاشووبە دەکردەوە کـە ئەگـەر تەنانـەت بـۆ یـەك کـاتژمێریش تـەواوی کاتژمێرەکانی (بەرلین) بە هەڵە کار بکـەن، ژیـانی بازرگانی لەو شارەدا دووچاری ڕاوەسـتان دەبێت.

بـەم جـۆرە، ڕسـتە سـەرەتاییەکانی وتارەکـەی (زیمیل 1971) لە نیگەرانی سەبارەت بە چارەنووسی





تاك لە بەرامبەر عەقڵانی بوونی فرەیی جیهاندا لەتەك نووسینەكانی (فیبەر)دا هاودەنگن، بەڵام بە بێ بەكاربردنی وێنایەكی بەدبینانەی وەك تەسەوری قەفەسی ئاسنین:

قووڵترین مەسەلەكانی ژیانی مۆدێرن لە هەوڵو تەقەلای تاكەوە بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و تاكایەتی لە بەرامبەر هێزە دەسەڵاتدارەكانی كۆمەڵگا و هەروەها لە بەرامبەر قورسی میراتی مێژوویی و كەلتووری دەرەكی و تەكنیكی ژیاندا سەرچاوەی گرتووە (ل 234).

ئەو، وەك (فیبەر) مەیل بە (كاتناسی قایلبوون بە لێپرسینەوە و (وردبوونەوە)ی بە هەڵقوڵاوی هێزەكانی جیهانی مۆدێرن دەزانی. ئەو دەیوت لە شاردا دەتوانرێ جەختی زیاتر لەسەر عەقڵانییەت بكرێت، چونكە عەقڵی جێنشینی نەرێت و كاری باو، فاكتەرێكی سەرەكییە بۆ ڕێنماییكردنی ژیانی ڕۆژانە. (زیمیل) وەك (فیبەر) نارەزایی لەو هەڕەشەیە دەربڕی كە كەلتووری مۆدێرن بە جەختكردن لەسەر عەقڵانیەتی ئامێری ئاراستەی سەربەخۆیی (تاك)ی دەكرد. لەگەڵ ئەوەشدا،





(زیمیل) حەزی نەدەکرد بگەڕێتەوە بۆ (گشتییەتی) سیستماتیکی کۆمەڵگا سونەتییەکان، چونکە لەوە گەیشتبوو کە کۆمەڵگای مۆدێرن بە شێوەی گاڵتەجاڕی هەم دیاردەی (تاکخوازی) دەخاتەوە و هەم یارمەتی بێهێزکردنیشی دەدات.

ئەو بە پەرۆشەوە بە لێکۆڵینەوەی ڕەوشگەلێکەوە خەریك بوو کە تاکەکان بە یارمەتی ئەوانە لێناگەڕێن ژیانی مۆدێرن لەناو خۆیدا غەرقیان بکات. بۆ نموونە، (زیمیل) خۆپاراستنی شارنشینانی –یان گوێپێنەدانی ئەوان–ی بە وەڵامێك بۆ غەرقکردنی ڕەوان دەزانی بە هۆی جۆرەها ئەنگیزەی بەردەوام و گۆڕاو، کە بەدەر لەو حاڵەتەدا (تاك) بە ئاسانی لەناو ژیانی مۆدێرندا دەخنکێنێت (Simmel 1971: 325-29) ئەو شتەی کە هەندێ کەس بە ساردی یان گوێپێنەدانی شارنشینان بیریان لێ دەکردەوە، ئەو بە ئامرازێکی پێویستی دەزانی بۆ پارێزگاریکردن لە بەرامبەر ئەو هەڕەشانەی لە تاکایەتی دەکرا.





## تراژیدیای کەلتوور

(زیمیل) [1977 (1892] دژایەتی نێوان تاك و بونیادی کۆمەڵایەتی لە پشت ئەو دیدە فەلسەفییەوە دەبینی کە لە لایەن فەیلەسوفی ئەڵەمانییەوە (کانت) پێکهاتبوو، بوونی مرۆڤی بە پێی دژایەتییەکی دووفاقی کە ژیانی لە بەرامبەر (فۆرم)[19]دا دائەنا، وەسف کرد. ژیان بەهێزێکی ناسنورداری داهێنەرێتی (خلاقیت) لەبەرچاو دەگیرا لە کاتێکدا کە (فۆرم)ەکان وەك هەندێ دەفر وێنا دەکران کە ژیان سنوردار و کۆنترۆڵ دەکەن. کەواتە هەموو بوونی مرۆڤ ململانێیەکی بەردەوامە لەگەڵ ژیاندا بۆ زاڵ بوون بەسەر (فۆرم)دا. بەڵام هەر بەو شێوەیەی کە ژیان خۆی لەدەست فۆرمێك ڕزگار دەکات، بە ناچار ڕووبەڕووی فۆرمێکی تازە دەبێتەوە-و، لە ڕاستیدا، فۆرمێکی تازە دەخوڵقێنێت. لۆژیکی بەرهەمهێنانی کەلتووری پێویستی بەکاری خوڵقاندن و وێرانکاری هەیە. ئەمە پێداویستی خەسڵەتی وێرانکەری ئەم پرۆسەیەیە کە (زیمیل)

هان دەدات قسە لەسەر تراژیدیای کەلتوور بکات (Nedelmann 1991).

تا ڕادەیەك (زیمیل) ئەم بابەتەی بە شێوەیەیکی نامێژوویی لەبەرچاو دەگرت (Simmel 1959, weingartner 1960).

بە کورتی، توانای چارەسەرکردن و وەلاوەنانی ئەم ناکۆکیەی نەبوو" و هەڵبەتە ئەم ناکۆکییە بە سادەیی بەشێك بوو. لە بارودۆخی مرۆڤ. کەسانی مارکسیستی وەك (جۆرج لۆکاش) خوێندکاری پێشووی، ڕەخنەیان بە هۆی ئەو (خواستەوە) لێدەگرت کە کەلتووری بە شتێکی (بێ زمان) لەبەرچاو دەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا (زیمیل) بە شێوەیەکی هاوئاهەنگتر لەوەی کە (لۆکاش) دەیخواست. خەسڵەتی مەرجداری مێژوویی ئەم پرۆسە دیالێکتیکیەی لە عیشقی خۆیەوە بۆ دژایەتییە جۆراوجۆرە تایبەتەکانی کەلتووری مۆدێرن دەسەلماندا. دەتوانین بڵێین تا ڕادەیەکی زۆر (زیمیل) لەگەڵ هەڵسەنگاندنی فیبەردا لەسەر خەسڵەتی ستەمگەرانەی عەقڵانیبوونی بوروکراتیك –فۆرمی بونیادی کۆمەڵایەتی کەلتووری مۆدێرن





پێك دەهێنێت- هاوڕایە، بەڵام شێوەی تێڕوانینی ئەو جیاواز بوو چونکە لە بنەڕەتدا حەزی بە بەتاوتوێکردنی ئەو شێوانە بوو کە تاکەکان بەهۆی ئەوانەوە وەڵامی چوارچێوەکان و زۆرەملێکانی مۆدێرنەیان دەدایەوە (Simmel 1971, 1984, Halton 1995).

## بەرەو (ئاقاری) کۆمەڵناسی بێکاری

(زیمیل) یەکەمین کۆمەڵناس بوو کە بایەخی دا بە جیهانی بێکاری و مەسرەفگەرایی. بۆ نموونە ئەم مەلەسەیە لە وتارێکیدا بە ناوی (مۆد)[20] (1904) بە ئاشکرا دەردەکەوێت. ئەو لەم وتارەدا هۆکارە جۆراوجۆرەکانی گۆڕانی (مۆد) چ پەیوەندی بە جلوبەرگ، چێشتلێنان و، هونەر و، کۆشکسازی، مۆسیقاوە هەبێت یان بە شتانی دی- لەناو کەلتووری مۆدێرندا دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە و ڕاڤەکردنەوە. بە پێی لافلێدانی ئەو هۆکاری سەرەکی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە ڕۆژگاری مۆدێرن (سەردەمێکی عەسەبی) ترە، چونکە بە پێچەوانەی ڕابوردووەوە چەشنە هەڵبژاردنێکی جۆراوجۆر بۆ

(مەسرەفکەران) دەخرێتە ڕوو کە شێمانەی ئەوە بە تاکەکان دەدات خۆیان لەوانی دی جیابکەنەوە. بە واتایەکی تر خەڵکی بە مۆدگەلی تازە و جیاواز بە ئاهەنگێکی خێراتر جەزب دەبن، چونکە دەیانەوێت فۆرم (شکل) بە شوناسی جیاوازی تاکەکەسیان بدەن.

لەگەڵ ئەوەشدا (مۆد) تەنها مەسەلەی هەڵبژاردنی تاکەکەسەکان نییە، لە ڕاستیدا ئەم هەڵبژاردنانە دابەشکردنی چینایەتی و جووڵانەوەی کۆمەڵایەتی ڕێکدەخەن. (زیمیل).

(ئەنتی تز)ی نێوان مەیلی جیاوازی تاکەکەس –مەیل بە جیابوونەوە و هاوتابوون –و خواست بە بەرابەری کۆمەڵایەتی– مەیلی تەواوی تاکەکان بە چاوپۆشیکردن لە پێگەی چینایەتی بۆ قایلبوون بە (مۆدە) باوەکان دەستنیشان ئەکاتەوە کە هەم بەشێکە لە ئەنگێزەیەك کە لە دوای هەڵبژاردنی (مۆدە)کانەوە جێی گرتوو و هەم بەڵگەیەکە بۆ دەورەی ژیانێکی ناپایەدار و کورتخایانی هەر (مۆد)ێکی تایبەت.

.(Simmel 1971: 262, Lipovetsuy 1990, 1994 Nadelman)





(زیمیل) 1971 بە شێوەیەکی وردبینانە ئەڵێ:

وا پێویست دەکا کە چیەتی تایبەتی (مۆد) تەنها لە یەك زەماندا بەدەست بەشێك لە گروپێکی دیاریکراوەوە بەکار ببرێت و زۆربەی تاکەکانیش بە تەواوی پەسەندی بکەن. هەرکە نمونەیەك بە گشتی پەسەندکراو هەر ئەوەی کە کارێك لەسەرەتادا ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی ئەنجامیان داوە و لە ڕاستیدا هەمووان ئەنجامی بدەن.. ئیدی ئێمە قسە لەسەر (مۆد) ناکەین. (مۆد) هەر بەو جۆرەی کە پەرەدەسێنێت هەر بەو شێوەیەش وردە وردە بەرەو نابودی دەچێت. (لاپەڕە 302).

ڕەنگە، (زیمیل) (14–313: 1971) تا ڕادەیەکی ناکۆکئامێز پێی وابووبێت کە (مۆد) یەکێکە لەو شێوانەی کە بە پاڵپشتی ئەو خەڵکی هەوڵ دەدەن (ئازادی دەروون)یان بپارێزن.

ئامادەی بۆ پەیڕەوی لە هۆکارە دیاریکراوە دەرەکییەکانی (مۆدە) ڕەوانەکان و وابەستەبوون پێیانەوە، کاردانەوەی ئامادەییە بۆ چاوپۆشیکردن لە سەربەخۆیی خود (ذات). بە بڕوای ئەو ئەوە تەنها پەیوەندی بە هۆکارە "دەرەکییەکانی





ژیانەوە" هەیە. ئەم ئامادەییە مۆڵەت بە (تاك) دەدات کە لە ناوەڕۆکی ئەودا پاساوی خۆی لەمەڕ پاراستنی ئازاد دەروونی چڕبکاتەوە. (weinstein and weinstein 1993: 10-23).

ئەو بە شێوەیەکی چونیەك سەرچڵی بە جۆرێکی کۆمەڵایەتی مۆدێرن لە قەڵەم دەدات. کەسێك کە لە ڕووداوی سەرکێشیەکدا دەرگیر دەبێت، هەوڵ دەدات لە ڕووداوە یەك جۆرەکانی ژیانی ڕۆژانە بچێتە دەرەوە و، لە قەڵەمڕەوی چالاکییەکدا لەتەك دەستوورئاهەنگی جیاواز و تایبەتدا هەنگاو هەڵبگرێت. کارکردن لە قەڵەمڕەوی پێویستدایە، بەڵام لە قەڵەمڕەوی کاتی بێکاریدا سەرچڵی و ئاژاوەگێڕی ڕوودەدات. لە جیهانی بیرۆکراتیك و عەقڵگەرا و ئەفسوون ڕەوێندا سەرکێشی ئەو دەرفەتە بۆ (تاك) فەراهەم دەکات -هەرچەند کەمخایەنیش بێت- کە لە زۆرەملێی و چوارچێوەکانی ئەو جۆرە ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییە ڕزگاری بێت. سەرکێشی مژدەی هەڵچوون و داهێنان و خۆکرانەوە دەدات.





لـەو ڕووەوە نموونەیـەك کـە (زیمیـل) قسـەی لەسـەر دەکـات، سەرکێشـی ئـەوینێکی نهێنییـە (شـاراوە) لەتـەك ئاوێتەیـەکی ئـارەزوو فریـودەر و مەترسیهەڵگر،

.(Simmel 1971: 187-98, Lymandscott 1975: 147-58)

ئەو شتەی کە (زیمیل) دەیخستەڕوو یەکێك بوو لـە لایەنـە زۆر گرنـگ و بەرفراوانـەکانی ژیـانی مۆدێـرن، لایـەنێك کـە لەوەوبـەر لـە توێژینـەوەکانی کۆمەڵناسـیدا بـە تـەواوەتی فـەرامۆش کرابـوو. چەمکی سەرکێشی هـەندێ چالاکی جۆراوجـۆری لەخۆدەگرت کـە بریـتی بوو لـە گەشت و کێبـەرکێ وەرزشـییەکان و قومـار و چالاکییـەکانی دەرەوەی مـاڵ وەك، گەمیـەوانی و شـاخەوانی. بـە کورتـی کۆمەڵناسی (زیمیل) لـەو بڕوایەدایـە کـە مۆدێرنـە (مومکینە) لە کاتێکدا دەرك بکرێت کە هەوڵ بدەین تا لە پەیوەندی دیالەکتیکی نێوان کار لەگەڵ گەمـە و هەروەها قەڵەمڕەوی پێویستی (ضرورت) لەگەڵ قەڵەمڕەوی بێکاریدا تێبگەین.

.(Sellerberg 1994: 75-82, Simmel 1971)





دەربارەی ئەوەی کە ئایا دەبێ (زیمیل) بە مۆدێرن یان پۆست مۆدێرن بزانین، ئومێدەوارم بە گەڕانەوە بۆ پێناسەگەلی کاتی ئەوەمان روونکردبێتەوە کە پێناچێت ئەو لە قاڵبی هیچ کام لەو دوو خواستە (گرایش)ە فەرهەنگییەدا بە تەواوەتی بگونجێت. هەر بەو شێوەیەی کە توێژەرەوەی دێرینی بەرهەمەکانی (زیمیل) (دۆناڵد لوین)[21] (1985) وتوویەتی: ئەمەش لەبەرئەوەیە کە جیهانێك کە ئێمە تیایدا دەژین تەواو نادیار یان تەمومژاوییە، کەواتە نە گەشبینی زیادەڕە و پاساو هەڵئەگرێت و نە بەدبینی. جیا لەمانەش ڕەنگە ئەو شتەی کە ئێمە بە پۆست مۆدێرن ناودێری دەکەین لە ڕاستیدا نیشانەیەکی سەردەمی مۆدێرن بێت، واتە لایەنە نێگەتیڤ یان شێوە تاریکەکەی. ئەتوانین بڵێین (زیمیل) ڕەنگە زیاتر لە هەموو ئەو تیۆرسێنە کلاسیکانەی دی کە تاوتوێمان کردن نادیار بوونی سەردەمەکەی خۆی دەرك کردبێت و لە ڕاستیدا کۆمەڵناسی (ئەو) بە ڕەنگدانەوەی قووڵی ئەم تێگەیشتنە لە قەڵەم دەدرێ.

## ڕۆبەرت پارك و قوتابخانەی شیکاگۆ

(زیمیل) دەیزانی لەبەرئەوەی کە تیۆر یان ڕەوشێکی سیستماتیکی کۆمەڵناسی بەجێ نەهێشتووە، میراتە فکرییەکەی وەك دراوگەلێك لەناو کۆمەڵناسانی دوای خۆی دابەش دەکرێت و بە شێوەگەلی جیاواز و بۆ مەبەستی جۆراوجۆر کەڵکی لێوەردەگرن. یەکێك لەو توێژەرەوانەی کە زیاتر لەوانی دی کەوتە ژێر کاریگەری ئەندێشەی (زیمیل)ەوە (ڕۆبەت پارك)[22] بوو یەکێك لە بەرجەستەترین کەسایەتییەکانی قۆناغی پێکهێنانی پەرەسەندنی کۆمەڵناسی ئەمەریکا. ئەوەی کە (ئەو) چۆن بە کەسایەتییەکی تەوەری لە پێکهێنانی ئەو شتەی کە بە "قوتابخانەی کۆمەڵناسی شیکاگۆ" ناوبانگی دەرکرد، پرۆسەیەکی درێژخایان و ناڕاستەوخۆ بوو، بەڵام گومانی تێدا نییە کە (پارك) لەو ڕەوەندەدا ڕۆڵێکی گرنگ و بەرجەستەی هەبوو.

(پارك) ساڵی 1864 –ساڵی لەدایکبوونی ماکس فیبەر– لە دایك بوو و ساڵانی پێکهێنانی ژیانی لە

ناوچەیەکی تا ڕادەیەك گوندنشینی (ڕۆدینگ)[23]دا لە (مینسوتا)[24] بەسەر برد. تەنها ڕووداوی گرنگی سەردەمی لاوێتی کە (پارك) لە ساڵانی دواتری ژیانیا لە یادهێنانەوەی چێژی دەبرد ڕووبەڕووبوونەوەی بوو لەگەڵ (جسی جیمز)[25]دا جەردەیەك کە ناونیشانی ئەو گەڕەکەی لەو وەرگرتبوو (Raushen bush 1979, 6).

(پارك) مینسوتای جێهێشت تا خوێندنی باڵا لە زانکۆی شیکاگۆدا درێژە پێبدات و لەوێدا بوو کە لە پۆلەکانی وانەی فەیلەسوفی بەناوبانگ (جۆن دیڤی)[36] بەشداری کرد. ئەو دوای خوێندن کاری بۆ ژمارەیەك لە ڕۆژنامەکانی شار دەکرد. ئەم قۆناغەی ژیانی کاتێك کۆتایی هات کە گەڕایەوە بۆ کۆلیژ و چووە زانکۆی هاوارد تا لە بواری فەلسەفەدا درێژە بە خوێندن بدات. لەو شوێنەدا مامۆستایانی ڕێنمویکەری دانشمەندگەلێکی بەرجەستەی وەك (ویلیان جیمز)[27] و (جۆرج سانتایانا)[28] و (جۆسا یارویس) بول.

لەو سەردەمەدا ئەو وەك زۆرێك لە هاوولاتییەکانی بە مەبەستی خوێندن سەفەری بۆ





ئەڵەمانیا کرد. ساڵی 1899 بۆ یەکەم جار لە (زانکۆی بەرلین) بە ئامادەبوونی لە وانەکانی (زیمیل)دا ڕووبەڕووی کۆمەڵناسی بووەوە. لە ڕاستیدا تێکڕای ئەم وانانە فێرکاری ڕەسمی (پارک) یان لە زەمینەی کۆمەڵناسیدا پێکهێنا. جێی سەرسوڕمان نییە کە (زیمیل) هەر بەو شێوەیەی کە مێژوونووسی هزرمەند (فرید مەتیوز)[29] (34: 1997) نوسیویێتی: (بە تەنهایی گرنگترین کاریگەری لەسەر تیۆرە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵناسی، پارک هەبووە)

(پارک) لەم باوەڕەدا لەگەڵ (زیمیل)دا بەشدار بوو کە مۆدێرنە ئاشکراترین ڕوخساری خۆی لە شاردا ئەنوێنێت. پارک (167 :1950) زەمانێك سەبارەت بەم مەسەلەیە ئەوەی ئاشکرا کرد کە جیهان "ڕەنگە لە نێوان دوو چیندا دابەش بکرێت: کەسانێك کە گەیشتوونەتە شار و کەسانێك کە هێشتا نەگەیشتوون". پارک (87 :1952) بە واژەگەلێك کە گوایە بە خامەی (زیمیل) نووسراون نوسیویەتی "لە شاردا هەموو بەرزەفڕییە نهێنییەکان و تەواوی ئاواتە ئاشکراکان دەرفەتێك بۆ خۆدەرخستن پەیدا





دەکەن. شار سروشتی مرۆڤ بە تەواوی ئاشکرا دەکات و بڵاوی دەکاتەوە و ڕایدەگەیەنێت".

کۆمەڵناسی مۆدێرنەی (پارک) لە ڕادەبەدەر جەختی لەسەر وردە گرووپە جیاوازە شارنشینەکان دەکرد. ئە و شتەی کە (پارک)ی لە ماموستاکانی جیادەکردەوە خۆشەویستی توندی ئەو بوو لە بەرامبەر گرووپە ڕەگەزی و نەتەوەییەکاندا کە لە کۆتایی ساڵەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەرەو شارەکان کۆچیان کرد. ئەمە ڕەنگدانەوەی ڕیشەیی ئەمەریکایی ئەو بوو، چونکە گرنگی جیاوازییە نەژادی و نەتەوەییەکان لە شارەکانی ئەمەریکادا گەلەك ئاشکراتر بوو لە شارەکانی ئەڵمانیای (زیمیل)

Park 1950, Burgess, and Mckenzie 1925: Lal 1990,)

.(Kivisto 1990

لەگەڵ ئەوەشدا پێش ئەوەی پەرە بە دیدگا کۆمەڵناسیەکەی خۆی بدات سەرلەنوێ بۆ ماوەیەکی زۆر لە زانکۆ دوورکەوتەوە. دوای ئەوەی کە لە ئەوروپا گەڕایەوە بۆ هاروارد، باسەکەی





(نامیلکەکەی) تەواو کرد کە گەڵڵەکەی لە ئەڵەمانیا دارشــتبوو. چــاوەریی دەکــرد بــەو بروانامــە دکتۆرایــەی کـە تـازە وەریگرتبـوو بـە دوای کـاری زانکۆییدا بگەریت، بەڵام لـە جیاتی ئەوە رویکردە هــەمان پیشــەی رۆژنامەگــەری و ئــەمجارەیان بــە شـیوەیەکی سـەربەخۆ و بـە خۆشەویسـتییەوە بـۆ ریفۆرمە کۆمەڵایەتییەکان.

لــەو ســەردەمەدا (پــارك) بــە چالاکییــەکانی ئەنجومــەنی ریفۆرمــی (کۆنگــۆ)وە دەرگــیر بــوو، ریکخراویـك کـە ئامـانجی فـیرکردنی خـەلکی بـوو سەبارەت بە وەبەرهینانی (استثمار) بیرەحمانـەی خەلکی (کۆنگۆ) لە لایەن بەلچیکاوە، ئەو سەردەمە شا (لئوپولد) جلەوی کاروبارەکـانی بـە دەسـتەوە بوو. ئەو سکرتیری ئەم ئەنجوومەنە بوو و زنجیرە وتاریکی ریسواگەرانەی لەگەل هەندێ ناونیشانی وەك (پارەی خوینی کۆنگۆ) و (چیرۆکی ترسناکی کۆنگــۆ)ی نوســی کــە لــەو چاپەمەنیانــەی زۆر ئەخویندرانەوە وەك گۆڤاری (مانسی)[30] و گۆڤاری (ئیڤری بۆدی)[31] و (ورەلد تودەی)[32]، بلاوکرانەوە .(Lyman 1992, Kivisto 1993)





ئەو شتەی کە بە تایبەت لەم وتارانەدا ئاشکرا بوو پشتیوانیکردنی وتەیەکی مامۆستای پێشووی (ویلیام جیمز) بوو کە دەڵێ "پێشکەوتن شتێکی مەترسیدارە". (ستانفۆرد لێمن)[33] (44: 1992) ئاماژە بە ڕەخنەیەکی (پارک) دەکات لەژێر ناوی (دورنمای گوتیک) و مەبەستی ئەوەیە کە "ڕەخنە ئەو هوشیارییە بە خوێنەرەکانی دەدات کە لە بنەمای کۆمەڵایەتی مۆدێرنەدا ترسگەلێکی واقعی و باو دێتە ئاراوە".

هەر لە ڕێگەی بەشداریکردنی ئەو ئەنجوومەنەوە بوو کە (پارک) لەگەڵ بەرجەستەترین ڕێبەری ڕەشپێستی سەردەمی خۆی واتە (بوکەر واشستنەن)[34] ئاشنابوو. (واشنتەن) داوای لە (پارک) کرد کە ببێ بە نوێنەری چاپەمەنییەکەی کە بنکەیەکی فێرکاری بوو لە (ئالاپاما)، واتە ئەنستیتۆی (توسکیگ)[35]. (پارک) قایل بوو و بەم جۆرە دەستی کرد بە دەورەی کاری حەوت ساڵە لە ناوچەکانی باشووردا.

لەوێدا (پارک) بەرپرسی (پەیوەندییە گشتییەکان) و نووسەری پشت پەردەی بنکەی

واشینتەن بوو. لەو ماوە درێژخایانەدا ئەم سپی پێستە باکورییە سەبارەت بە مەسەلە ڕەگەزیەکانی باشووری ئەمەریکا و کەلتووری ئەمەریکاییە بە ڕەچەڵەك ئەفەریقییەکان کە بنەمای گوندنیشینیان هەبوو گەلەك شت فێر بوو.

.(Matthews 1977: 57-84, Raushenbush, 1979: 39-63)

دەرئەنجام ژیانی زانکۆیی (پارك) دوای ئەم ماوە درێژخایانە بە فێربوونی شتانی تازە دەستی پێکرد. ئەو لە تەمەنی (49) ساڵیدا لە لایەن (تامس)[36] سەرپەرشتی ئەو کاتەی گرووپی کۆمەڵناسی زانکۆی شیکاگۆ و لەو زانکۆیەدا دامەزرا. دوای چەند ساڵێ بە پێی بڕیارێکی زۆرەملێیانە، (تامس) لە زانکۆدا بە هۆی گرتنییەوە بە تاوانی ئاکاری (لە کاتی هاتنە دەرەوەی لە ئوتێلێکدا لەتەك ژنێکدا کە هاوسەری نەبوو) ڕێگەی بۆ (پارك) خۆش کرد تا سەرۆکایەتی ئەو گرووپە بکات. ئەو تا دوای 25 سال ڕەنگە بەرجەستەترین هزرمەند بووبێت لە زەمینەی پیکهینانی کۆمەلناسی ئەمەریکادا. لە راستیدا قوتابخانەی شیکاگۆ بوو بە سەنتەری دونیای

کۆمەلناسی و، شاری شیکاگۆش تاقیگایەك بوو بۆ مامۆستایان و خویندکارانی زانکۆ.

## پەیوەندییە رەگەزیەکان لە جیهانی مۆدیرندا

تەوەری ئەسلی کۆمەلناسی (پارك) بە ئاگابوونە لەوەی کە جیهانی مۆدیرن لە ریگەی کۆچە گەورەکانەوە گرووپگەلیکی زۆری رەگەزی و نەتەوەیی لە سەرتاسەری جیهاندا لە دەوری یەك کۆکردۆتەوە کە بۆ ولاتانێك کە لە سەنتەری سیستمی نوێی ئابووری جیهاندان –بە تایبەت ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا– کۆچیان کردووە. هەندێ لەو کۆچەرانە بۆ بەدەستهێنانی زەوی روویانکردە گوندە دوورەدەستەکان بەلام زۆربەی ئەوانەی کە لە سەدەی بیستەمدا کۆچیان کرد لەو شارە پیشەسازییانەدا نیشتەجیٚ بوون کە خەریکی گەشەکردن بوون، چونکە لەو شارانەدا بوو کە ئیمکاناتی ئەسلّی کارکردن هەبوو. کۆچەرەکان ناچار بوون خۆیان لەتەك ژینگە فەرهەنگی و کۆمەلایەتییە تازەکەیان هەروەها لەتەك ئەو گرووپە





جۆراوجۆرانـــەی کـــە ڕووبـــەڕوویان ئەبوونـــەوە، بگونجێنن. (Park 1950, 1972).

پارك بە تایبەت بایەخی بە دەستنیشانکردنی پرۆسە ســازگارەکانی کۆچــەران دەدا. ئــەو وەك ڕیفۆرمخوازانــی سیاســی ئــەو ســەردەمە لــەوە دەگەیشت کە کۆچەران لە تێپەڕبوونیان لە دونیای کۆنەوە بۆ دونیـای تـازە بـە زۆری جێگۆڕکێیـەکی ناخۆشیان تاقی کردۆتەوە.

تـازە گەیشـتووەکان لــە نێــوان دوو ژینگــەی کەلتوریدا دەژیان:

چیـدی ئــەوان بەشــێك نــەبوون لــە کــەلتورە کۆنەکەیان بــەڵام بەشـێکیش نـەبوون لـە کـەلتوری تــازەش. ڕەنگــە ئــەم مەســەلەیە ئــەو شــتەی لێبکەوێتەوە کە (پارك) لە حاڵەتی جۆراوجۆردا بە (بێــهێزبوونی ڕۆح) یــان (شــڵەژاوی شەخســی) نــاودێری دەکــرد، بــەو مانایــەی کــە کۆنترۆڵــە کۆمەڵایەتی و بەها فەرهەنگییەکان کاریگەریان لـە یەکپارچــەیی تــاك لەگــەڵ کۆمــەڵدا نــەبووە. ئــەم مەســەلەیە کۆمــەکی دژواریگــەلێکی بــە زەبــری (بـالقوە) جۆراوجـۆری وەك نەخۆشــی دەروونــی و





خودکوژی و کردەوە خراپکارییەکان دەکرد (Park and Miller, 1921).

(پارك) تا ڕادەیەك هەر بەو جۆرە کە (زیمیل) کەسایەتی بێگانەی دەستنیشان کرد، کۆچەری بە (مرۆڤی پەراوێزی) لە قەڵەم دا.

لە کاتێکدا کە هەستی دژ بە کۆچکردن لە ولاتە یەکگرتووەکاندا گەیشتبووە لوتکە، (پارك) خەریکی نووسینی بەرهەمەکانی بوو و دڵسۆزانە داکۆکی لە کۆچەران دەکرد. ئەو دژایەتی ئەو موحافیزەکارانەی دەکرد کە خوازیاری هەرچی زووتری بە ئەمەریکاییکردنی کۆچەرانی تازەهاتوو بوون. لە دیدگای ئەو (مەڵبەندخوازانەوە)[37] ئەوە چاوەڕێ دەکرا لەو بێگانانەی تازە هاتبوون کە دەبێ بە خێرایی و بە تەواوەتی واز لە ڕیشەی فەرهەنگی خۆیان بهێنن. (پارك) هاوشێوەی ڕیفۆرمخوازانی وەك (جین ئادامز)[38] لە (هال هاوس)[39]دا، جەختی لەسەر سنگفراوانی و قایلبوون وەك دژە ژارێك بۆ (نەتەوە تەوەری) دەکرد. (Deegan 1988).





کەواتە، ئەندێشەی (پارک)یش لە زۆر ڕووەوە لە ئەندێشەی هاوچەرخانی وەک (هـوراس کـاڵن)[40] و (ڕاندۆلــۆف بــۆرن)[41] دەچــوو کە هـــەردووکیان لایەنگری (فرەچەشنی فەرهەنگی) بوون.

پلورالیستە فەرهەنگییەکان هەوڵیان دەدا گرووپە بەرجەستە ڕەگەزیەکان بپـارێزن. (کـالن) (1914) تـا ئەو جێگایـەش پێی داگرت کـە وتـی دیموکراسـی پێویسـتی بـەم جـۆرە گۆڕانکارییـە هەیـە. (بـۆرن) هـێزێکی لـەناو کـەلتووری کۆچەرایـەتیدا بـــەدی دەکرد کە ئومێدەوار بوو گیانێکی تازە بەو شتەی کە پێی وابوو فەرهەنگێکی تا ڕادەیەک ڕاوەستا و و بـــێ خەیاڵــە ببەخشــێت. (پـــارک) خـــۆی بـــە (واقیعخـواز)ێکـی سەرسـەخت دەزانـی و ڕەنگـە وا گومـانی کردبێـت کـە (کـاڵن) و (بـۆرن) لـە هـەندێ ڕووەوە کەسانی خەیاڵپەروەر و بێچارە بن.

(پـارک) وەک ئـەم دوو کەسـايەتییە ستایشـی جۆراوجۆر بوونـی کـەلتوورەکانی دەکـرد و لەتـەک هــاودەنگی ئینگلــیزیدا نــاکۆک بــوو. بــەڵام بـــە پێچەوانـــەی ئـــەم دوو هزرمـــەندە خـــۆی بـــە وەسفکردنی واقیعییەتەکانی ڕۆژانە و ڕەوەندەکانی





ئایندەوە تەرخان دەکرد و لەو باسانەش خۆی دەپاراست کە قسەی لەسەر لە پێشتری (فرەچەشنی کەلتووری) دەکرد.

(پارک) لەتەک پلورالیستە فەرهەنگییەکانیشدا جیاوازی هەبوو، چونکە ئەو پێی وابوو لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا ناتوانرێت کەلتوورە بەرجەستە نەتەوەیەکان بپارێزێت. ئەم کەلتوورانە بە هۆی کرداری بەرامبەرەوە لەتەک گرووپەکانی دیکەدا و هەروەها بە هۆی کاریگەرێتی کەلتووری نەتەوەیی بە دەسەڵاتی ئەمەریکاوە دووچاری گۆڕان و پووکانەوە دەبن. (پارک) لەو بڕوایەدا بوو کە (چوونیەکی) هێزێکی یەگجار بە دەسەڵاتە لە ئەمەریکادا کە نکوڵی لە توانای پایەداربوونی گرووپەکان و کەلتوورە بەرجەستەکان تا ئایندەیەکی (نادیار) دەکات.

لەم دیدگایەوە، هەر بەو شێوەیەی کە (باربارباالیس لال)[42] (1990) وتوویەتی (پارک) حەزی دەکرد جەخت بکات بە زیانی توێژینەوە نەگۆڕەکانی بونیادە کۆمەڵایەتییەکان لە پرۆسەی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا. سەرئەنجام دەبێ





بڵێین کە (چونیەك)ی پرۆسەیەکە کە پووکانەوەی پلە بە پلەی ناچوونیەکی کۆمەڵایەتی و کەلتووری لەخۆ دەگرێت. (لال) ئەم پرۆسەیە بە (پارادۆکسی نەتەوەیی) ناوزەد دەکات و ئاماژە بەو لافلێدانەی (پارك) ئەکات کە دەڵی بەشداریکردنی چالاکانە لە ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوەیدا خاوەن ئەو پێشهاتە نەخوازراوەیە کە کۆمەك بە یەکپارچەیی گرووپەکان و تاکەکان لە کۆمەڵگای گەورەتری خانەخوێدا دەکات. بەم پێیە (پارك) لایەنگرانی چونیەکسازی زۆرملێیانە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە بانگهێشت دەکات و ئیستدلالی ئەوە دەکات کە سیاسەتەکانی هاوکاریکردن و سنگفراوانی و کردەوەی خۆبەخشانە لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا یەکپارچەیی کەمینە ڕەگەزیەکان لە ڕەوتی ئەسڵی کۆمەڵگا و کەلتووری ئەمەریکادا دابین دەکات،

.(Park 1922, 1950, Park and Miller 1921, Lal 1990)





## ڕەگەز، بونیادی کۆمەڵایەتی

(پـارك) یـەکێك بـوو لـەو کۆمەڵناسـانەی کـە ڕوونکردنـەوە (ئـارکۆلۆژی)یـەکانی پەیوەندییـە ڕەگەزیـەکانی خسـتەلاوە. ئـەو پێـی لەسـەر ئـەوە دادەگـرت کـە دەبـێ ڕەنگـین پێسـتەکان بـە پێـی هۆکـارە کەلتوورییـەکان دەرك بکرێـن نـەك هۆکـارە (ئـارکۆلۆژی)یـەکان. بـۆ نموونـە، ئـەو سـەرنجی ئەوەی دەدا هەر لـەو کاتـەدا کە کۆچی بەرفراوانی ئەوروپاییـەکان بـەرەو ئـەملای ئۆقیانووسـی ئەتڵەسـی ڕوویـدەدا، ئەمەریکاییـە بـە ڕەچەڵـەك ئەفەریقاییەکان لە ناوچە گوندییـەکانی باشوورەوە بـەرەو ناوچـە شـارییەکانی بـاکووری ئەمـەریکا کۆچیـان دەکـرد. بـە بـڕوای (پـارك) ئـەتوانین لـە بنـەڕەتدا بـە یـەك شـێوە لـەم دوو کۆچکردنـە تێبگـەین. لـە هـەردوو حاڵەتەکـەدا خـەڵکێکی لـە بنـەڕەتدا وەرزێـر لـە ئەنجوومەنگـەلێکی پێـش مۆدێـرن و پێـش پیشەسـازییەوە ئـەچووە نـاو ژینگەیـەکی مۆدێـرن و پیشەسـازی شـارییەوە و ناچار بوو خۆی لەتەکیا بگونجێنێت.





پێشتر (پارك) وا تەسەوری دەكرد كە (چونیەك) بـوون هـێزێكی كۆمەڵایـەتی بـە دەسـەڵاتە كـە وەك چۆن نەتەوە جۆراوجۆرەكان لە جیهانی مۆدێرنـدا ڕووبەڕووی یەكتر ئەبنەوە بە شێوەیەكی ناچاریش گرفتاری ئەو شتە دەبن كـە ئـەو سـەردەمانێك بـە "سوڕی پەیوەندییە ڕەگەزیەكان" ناوی دەبرد. ئەم سوڕی پەیوەندییە ڕەگەزییانە پرۆسـەیەكی چوار قۆناخیـە كـە لەگـەڵ كـارلێكی یەكـەمدا دەسـتپێدەكات، لەقۆناغـەكانی ناوەڕاسـتدا بەربەرەكانێ و هاوكاری تێدەپەڕێت و بە (چونیەك) بوون كۆتایی دێـت (Park 1950 Lymon 1968). بـەم جۆرە مۆدێرنـە بە هـێزێكی گـەورەی (چونیەكسـان) لەبـەرچاو دەگـیرێت). هـەروەها (پـارك) سـەرنجی ئـەوەی دەدا كـە بەربـەرەكانێ و خۆڕاگـری لـە بەرامبـەر یەكپارچـەبووندا ڕەنگـە بـە ڕووكـەش بـە شێوەیەكیناسـنووورداری پایـەدار بمێنێتـەوە. بـە تەواوەتی ئەو لەم ڕاستییە بە ئاگابوو كە ڕەگـەز و جیاوازییـە ڕەگەزیـەكان –وەك بونیادگـەلێكی كۆمەڵایـەتی، نـەك واقیعیەتگـەلی ئـاركۆلۆژی– لـە بـەردەوامبوونی ناكۆكییـە گروپییـەكان و هـەروەها

بـەرگریکردن لـە (چونیـەك) بوونـدا ڕۆڵێکـی بەهێزی هەیە.

(پارك) لە ئاستی (نێوان تاکی) (میان فردی)دا بیری دەکردەوە کە دەشێ جیاوازییە ڕەگەزیەکان چ مانایەکیان بۆ پەیوەندی نێوان گرووپییەکان (میان گروهـی) هـەبێت. لـە وتـارێکی وردبینانـەدا لـەژێر ناوی "لەپشت دەمامکەکانمان"[43]ەوە ئاکامـەکانی بارودۆخی ئەو پەیوەندییـە ڕەگەزییانـەی تـاوتوێ کرد کە تاکەکان ناچارن لە پشت دەمامك (ماسك)ی ڕەگەزەکەیانـەوە خۆیان بشارنەوە (Park 1950). تـا ڕادەیـەك لـەم وتـارەدا قـەرزاری (زیمیـل)ی مامۆستایەتی، بە تایبەتی قەرزاری ئەو وتارەی کە دەربارەی "گرنگی جوانناسی ڕوخسار"[44]

(Simmel 1959: 276-81) و تـا ڕادەیـەکیش قـەرزاری شیعری "ئێمە دەمامك لەسەر ئەکەین"[45]ی (پـاول لارنـس دانبـار)[46] کـە شـاعیری رینسانسـی (هـارلم)[47](1974) بـوو. (پـارك) لـەو بروایـەدا بـوو لـەو کۆمەلگایانەدا کە جیاوازییە ڕەگەزیـەکان بـە گرنـگ دەزانـن، تاکـەکان رەگەزەکـەیان وەك دەمـامکیك دەدەن بـە روخسـاریاندا. دەرئـەنجامی ئەوانـە

تاكەكانی ڕەگەزەكانی دی بە تەواوەتی یەگدی وەك نوێنەری قەرەبووكراوەی نەژاد دەبینن. لە ڕاستیدا تاكەكانی دی لە ڕووی دابەشكردنە ڕەگەزیەكانەوە سەیری ئەوان دەكەن‌و ڕای دەگەیەنن كە "بە ڕای من تەواوی ئەوانە لەیەك دەچن". كەواتە دەمامكە ڕەگەزیەكان ناهێڵن كە خەڵك بە (تاك) لە قەڵەم بدرێ، (پارك) بەم جۆرە ئەنجامگیری دەكات كە لەو جۆرە كۆمەڵگایانەدا پەیوەندییە ڕەگەزیەكان لەتەك كرژبوون و دوژمنایەتی زۆردا ئاشكرا دەبێت.

لەو ڕووەوە كە (پارك) بەوە قایل بوو كە (تاكخوازی) یەكێكە لە تایبەتمەندییە بەرجەستەكانی مۆدێرنە، مومكین بوو كۆسپە نەژادییەكان بە دەربڕینی ئەو بە باشی بە پاشماوەی كەلتووری پێش مۆدێرن یان سونەتی بێتە ئەژمار. پێشتر (پارك) وا تەسەوری دەكرد لەبەرئەوەی كە مۆدێرنە، نەرێتەكان ڕیشەكێش دەكات، گرنگێتی ڕەگەز كەم دەبێتەوە و چین (طبقة) گرنگتر دەبێت. (پارك) جەختی لەسەر حەتمیبوونی بەرەبەركانێ و دژایەتی لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا دەكرد و لەو بڕوایەدا بوو كە

بەرەبەرکانێی ڕەگەزی بە شێوەیەکی بەرفراوان جێگەی خۆی دەدات بە دژایەتی چینایەتی، واتە هۆکاری دابەشکردن و بەرەبەرەکانێ هاندەری ژیانی هاچەرخ دەبێت. بەڵام لە ساڵانی دواتردا پەی بەوە برد کە ڕەنگە ڕەگەز بە شێوەیەکی بەزەبر وەك هێزێکی کۆمەڵایەتی بەتوانا تا ساڵانێکی درێژخایان بەو جۆرە بمێنێتەوە. ئەو لەگەڵ دیدگا یۆتۆپیاکەی (پارسنوز)دا سەبارەت بە نوێنگەی (دورنمای) چارەسەرکردنی کێشە ڕەگەزییکان لە ئەمەریکادا هاوڕا نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، (پارك) هێندەش بەدبین نەبوو کە ئەنجامگیری ئەوە بکات ڕەگەز مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتییە و کۆنترۆڵ ناکرێت.

ئەو لە ناوەندی ژیانی مۆدێرندا، واتە شار- بە جیاوازی کۆمەڵایەتی، جموجوڵ و تایبەتمەندی چەند لایەنییەوە- جۆرەها پەیوەندی کۆمەڵایەتی تازەی لە حاڵەتی دەرکەوتندا بەدی دەکرد کە توانای ئەوەیان هەبوو ڕەگەز بگۆڕن بە هێزێکی کەمتر بەرجەستە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا. بەم جۆرە پێشکەوتن لە پەیوەندییە گشتییەکاندا بە خاوەن





توانایەکی بەزەبر لەبەرچاو دەگیرا بۆ کەمکردنی ڕادەی گۆشەنشینی بە کۆمەڵ و هاندان بۆ سنگفراوانی زیاتر (Smith 1988: 123-31, Matthews 1977: 157-74). کەواتە تێگەیشتنی (پارك) لە کەلتووری مۆدێرن وەك (زیمیل) شێوەیەکی ناسنوورداری گەشبینانە لەخۆ ناگرێت. لە ڕاستیدا پشتگیریکردنی لانی کەمی لە مۆدێرنە، دەرەئەنجامی هۆشیاریەتی لە خەسڵەتی ناکۆکییەکانی ئەم سەردەمە.

(پارك)، (وەچەیەك)ی لە کۆمەڵناسان پەروەردە کرد کە زۆرێکیان بوون بە کەسانێکی بەرجەستە لەم بوارەدا وەك (هێربرت بلۆمەر)[48] دامەزرێنەری بەرجەستەی دیدگای تیۆری ناسراو بە "کرداری هێمای بەرامبەر" و (ئیڤریت هیون)[49] کە هەردووکیان وەچەیەکی تریان لە خوێندکارانی زانکۆ پەروەردە کرد. تایبەتمەندی بەرجەستەی کۆمەڵناسی قوتابخانەی شیکاگۆ، مەیلێکی بەهێز بوو سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی نەتەوەگەرایی کە وەسفە ورد و قووڵەکانی بەشە جیاجیاکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لەخۆ گرتبوو. بەم جۆرە پێڕیستی

بەشـــێك لـــە توێژینـــەوەكانی خوێندكـــارانی قوتابخانەی شیكاگۆ بریتی بوو لە هەندێ گوزارش دەربـــارەی بـــێ خـــان و مانـــەكان، پەیوەندییـــە ڕەگەزیـەكان لـە شارە بچووكـەكاندا، هۆڵـی سـەمای تاكسـی (ڕووپۆشـێك بـۆ سـۆزانچێتی)، پیشـــەی پزیشكی، گرووپـی خراپكـاران "جـەك ڕولرەكـان" واتە (ئەو دزانەی كـە لـە شـەقامەكاندا بـە مەبەستی دزیكـردن هـێرش بـۆ خـەڵكی دەبـەن) و خوێندگـا گشـتییەكان. یـەكێك لـە تایبەتمەندییـەكانی ئـەم نـەرێتی توێژینەوانـە كـە ئـەتوانین بڵێـین (پـارك) داهێنـەری بـوو، تێگەیشـتن بـوو لــە ڕوخسـاری دووفـاقی مۆدێرنــە. كۆمەڵناسـانی قوتابخانــەی شیكاگۆ تابەتمەندییـە پۆزەتیڤـەكانی مۆدێرنـەیان دەرك دەكـرد و بــە تایبەتمــەندی كۆسمۆپۆلیـت و (جیهان مهنی) گشـتگیرانەی (ئـەو) قـایل دەبـوون. لەگـەل ئەوەشدا ئەوان هەستیار بوون لە بەرامبـەر لایەنـە نیگەتیڤـەكانی بـارودۆخی مۆدیـرن و ئـەو نائارامیانەی كە دروستی دەكرد.





## پۆست مۆدێرن و تیۆری کۆمەڵناسی

ماوەیەکــە واژەی (پۆســت مۆدێــرن) بــرەوی پەیداکردووە. بۆ نموونـە (سـی رایـت میلـز) (166: 1959).

بێ ڕوونکردنەوەیەکی زۆر سەبارەت بە دیدگای خۆی، ڕایگەیاند: "دەورەی پۆست مۆدێرن ئەبێتە جێنشینی سەردەمی مۆدێرن".ئەم واژەیە لە کاتی ڕاگەیاندنەکــەی (میلــز)ەوە لــە زۆر شــوێنی جۆراوجۆری دیکەشدا دەرکەوتووە، بەڵام نزیك بە دوو دەیە لەمەوبەر کتوپڕ لەناو زانکۆکـانی وڵاتـە یـەکگرتووەکاندا دەرکــەوت و –لــە ڕاســتیدا لــە سەرچاوەی ئەدەبی و فەلسەفی فەڕەنسییەوە هاتە ئاراوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پۆست مۆدێرن، لە مێــژووی کورتــو پــڕ کێشمەکێشــی خۆیــدا کاریگەرییەکی ئاشکرای لەسەر بـوارە تایبەتـەکان بـە تایبــەت ئــەدەبیات هــەبووە کــە لــە ئاکــامدا ژمارەیــەکی زۆر لــە بەدەســەڵاترین لایــەنگرانی، کورسییە گرنگەکانی زانکۆ بەناوبانگەکانیان داگیر کرد– وەك (ستانلی فیش)[50] لـە زانکـۆی (دۆك) و





(هۆستن باکەر)[51] لە زانکۆی پنسیلونیا. لەگەڵ ئەوەشدا، پۆست مۆدێرن بە هێواشی چووە ناو کۆمەڵناسییەوە و لە چاو هەندێ بوارەکانی دیکەدا کاریگەرییەکی کەمتری هەبوو (Seidman 1994, Kivisto 1994, Gottdiener 1993, Rosenau 1992).

ئاشکراکردنی ئەو خاڵە گەلەك گرنگە کە ئێمە پێمان خۆشە بزانین قسەکردن لەسەر پۆست مۆدێرنیزم وەك تیۆرێکی فەرهەنگی چ واتایەك لەخۆ دەگرێت (Touraine, 1995, Lash, 1990).

کەواتە، لێرەدا گرنگی بە لافلێدانەکانی مەعریفەناسی پۆست مۆدێرن، نادەین. هەر بەو جۆرەش بایەخ بە ڕەخنەی ئەدەبی پۆست مۆدێرن نادەین کە "بنەما سڕینەوە" ناسراوە.

(Rosenau 1992, Jameson 1991, Agger 190).

هەندێ دژواری لە ڕاڤەکردندا سەبارەت بە سازگاربوون لەگەڵ چەمکی فەرهەنگی پۆست مۆدێرندا، بەرچاو ئەکەوێت. یەکەم، بە زۆری تیۆرسێنە پۆست مۆدێرنەکان بۆچونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بەوەی کە (پارامەترە)کانی پۆست مۆدێرن چ شتگەلێکن! بۆ نموونە، (نۆرمان





دنزیـن)[52] (vii :1991)، کـە ئەندێشـەکانی پۆسـت مۆدێرنـی دووچـاری گـۆڕان کـردووە، چـەند پێناسەیەکی لە زاراوەی پۆست مۆدێرن کردووە کە یـەکێکیان ئەوەیـە کـە پۆسـت مۆدێـرن "پێناسـە ناکرێت". دووهەم، ئەوەی کە پۆست مۆدێرنەکان بە زۆری بە زمانێکی تەمومژاوی دەنووسن و قسە دەکـەن و بـەم جـۆرە، تەنـها کەسـانێك لـە ئەندێشـەکانیان دەگـەن کـە لـە تـەك ڕەمـز و ڕازی هـەندێ چـەمکی وەك "دژە بنەماشـکێنی" و "وتـە تـەوەری"، "بانواقیعیـەت"، "وێچکوونـە وەهمییەکان" ئاشنایەتیان هەیـە. بەڵگـەی سێهەم کـە سـەبارەت بـە سـەرچاوەی فیکـری فەڕەنسـی مۆدێرنە، بە ئاشکرا پەیوەندی بە خاڵی دووهەمەوە هەیە کە تیایدا خواستێك بۆ لافلێدانێکی تـازە دەخرێتـەڕوو، هـەروەها باسوخواسـتێك هەیـە کـە کیبەرکییان لەسەر دەکریت و، ئەمە دیاردەیەکە کە لـە هۆشـیاری تایبـەتی شـێوازی ڕۆشـنفکرانەی فەرەنساوە سەرچاوەی گرتووە.

ئیمـە لـەو دوو بابەتـە پیکـەوە گریـدراوە دەکۆلینەوە کە بـە شـیوەیەکی جۆراوجـۆر زەینـی





هەندێ لە هزرمەندە سەرەکییەکانی ئەندێشەی پۆست مۆدێرنی بەخۆوە سەرقاڵ کردووە، واتە ڕەخنەی "ڕیوایەتە گەورەکان" و لەناوبردنی جیاوازی نێوان واقیعیەت و "بان واقیعیەت".

## کۆتایی ڕیوایەتە گەورەکان

لە گوتاری پۆست مۆدێرندا ڕیوایەتە گەورەکان ئاماژە دەدەن بە گوزارشەکان یان ڕوونکردنەوە تەواوەکانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی هەنووکەیی و ڕەوەندەکانی ئایندە: (مارکس) دەربارەی لۆژیکی پەرەسەندنی سەرمایەداری و، (فیبەر) دەربارەی عەقڵانیبوون، (دۆرکهایم) دەربارەی پەرەسەندنی پەیوەندی ئۆرگانیکی و، (پارسنۆز) دەربارەی یەکپارچەبوونی پلە بە پلەی گرووپە پەراوێزییەکان لە ڕەوتی بنەڕەتی کۆمەڵایەتی و کەلتوری کۆمەڵگادا هەندێ لە نموونەکانی ڕیوایەتە گەورەکانن کە ئێمە لە بەشەکانی پێشوودا لێکۆڵینەوەمان لەسەر کردن. هەرچەند ئەم تیۆرانە جیاوازیان هەبێت، بەلاّم لەم باوەڕە





رۆشـــنگەرانەیەدا هاوبەشـــن کـــە ئێمـــە توانـــای گشتگیرکردنی ئەو جیهانە کۆمەڵایەتییەمان هەیە کە تیایدا دەژین و بە هۆی ئەو تێگەیشتنەوە کە بە کۆمـــەکی ڕیوایەتـــە گـــەورەکان بەدەســـت دێـــت، دەسەڵاتی ئەوەمان دەبێت کە کۆمـەڵگا بگۆڕین و کۆمەڵگایـــــەکی باشـــــتر دروســـــت بکـــــەین (Bestand Kellner 1991: 8).

پۆست مۆدێرنـەکان بـە بەدبینییـەوە تەماشـای ئـەم باوەڕانـە دەکـەن. بـۆ نموونـە تیۆرسـێنی فەڕەنســـی (ژاك دریـــدا)[53]، بنـــەمای ڕیوایەتـــە گەورەکان بە بەرهەمی شتێك دەزانێت کە بە وتـە تەوەری (سخن محوری) ناودێری دەکات.

مەبەستی لەو قسەیە ئەو شێوە بیرکردنەوانەیە کـــە لافلێدانـــەکانی حەقیقـــەت بـــۆ ڕووداوە ڕاستەقینەکان دەگێڕنەوە. بە واتایەکی دی بناغەی هۆشیاریمان لـە جیهانی کۆمەڵایـەتیدا، باوەڕبوونـە لەسەر ئەو بنەمایەی کە دەتوانین کۆمەڵگا بەردەوام گـۆڕاو و گەلـەك ئاڵۆزەکانمـان بـە گەڕانـەوە بـۆ پرەنسیبگەلێکی نەگۆڕی دیـاریکراو دەرك بکـەین. دیدگـای پۆســت مۆدێرنــی (دریــدا) (1978، 1976)





خوازیـاری ڕەتکردنـەوەی (وتـە تـەوەری)یـە کـە بریتییە لە پەسەندکردنی ئەو دیدگایەی کە پۆست مۆدێرنـەکان بە دیدگای (دژە بنـەماخوان) نـاودێری دەکەن. پۆست مۆدێرن لە زێدەڕەوترین فۆرمدا، بە تـەواوی ڕەتکردنـەوەی هـەموو نـەریتی فەلسـەفی خۆرئاوایـە و پیشـاندەری شـێوەیەك لـە گومـانی زیادەڕەوییە بە تواناکانی (تـاك) بـۆ درێژەپێدانـی نـەریتی کۆمەڵناسـی بـەو جـۆرەی کـە لـە سـەدەی نۆزدەهەم بەدواوە وێنا (تصور) کراوە.

ئـەتوانین بـە شـێوەیەکی مـاقوڵ، ئـەنجامگیری بکـەین کـە پۆسـت مۆدێـرن فۆرمـی هاوچـەرخی (نیـهلیزم)ە– دۆخێکـی بـێ ڕەوشـە کـە بـە لەدەسـتدانی (مانـا) و لەدەسـتدانی (ئیمـان) و بـە هـۆی تواناکانمانـەوە لـە وەرگـێڕانی تیـۆرەوە بـۆ پراکتیـك بەرجەسـتە دەبێـت. ئـەو بـاوەڕە ڕۆشنگەرانەیە خراوەتە لاوە کە جیهانی عـەقڵانیتر جیـهانی ئینسـانیتری لێ دەکەوێتـەوە. بـە لەبـەرچاوگرتنی ئـەم مەسـەلەیە دەتوانـین پۆسـت مۆدێـرن بـە هـاندەری ناچـاری یـان ناچـالاك (پاسیف)ی سیاسی یان ناعەقڵانییـەت بزانـین کـە





باسوخواستی سیاسی کۆنەپەرستانە،هاندەدات.
.(O’Neill 1995, Callinicos 1989)

## لایەنگری سیاسی پۆست مۆدێرنەکان

ئەو شتەی کە تا ڕادەیەك جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە زۆرێك لە پۆست مۆدێرنەکان خۆیان بە باڵی چەپی سیاسی و بەم جۆرە لایەنگری بزاوتە پێشکەوتنخوازە جۆراوجۆرەکانی وەك بزاوتە دژ بە ئیمپریالیزمەکان، داکۆکی لە مافی ژنان و ئازادی هیمۆسێکسواڵەکان دەزانن. لەگەڵ ئەوەشدا نموونەیەك لەوەی کە ئەم جۆرە پۆست مۆدێرنە (بنەما سڕینەوە)یە چۆن کاردەکات، مومکینە تا ڕادەیەك قازانجێکی دیاریکراوی بۆ سیاسەتی چەپەکان هەبێت. (گیاتری سپیڤۆك)[54] لە وتارێکدا لەژێر ناوی "ئایا کۆیلەو ژێردەست دەتوانێ قسە بکات؟"[55] (1988) ئەو بەڵگە دەخاتەڕوو کە دەبێ گوێ لە دەنگی خەڵکی پەراوێزی و بێدەسەڵات بگرین نەك ئەوەی کە لێگەڕێین خەڵکانی (مومتاز) تر و بەدەستەڵاتتر هەوڵبدەن بە ناوی ئەوانەوە قسە





بکەن. (سپیڤۆک) یەکێکە لە لایەنگرانی مافی ژنان و لە ئەمەریکادا وانە دەڵێتەوە. ئەو یەکێکە لە وەرگێڕەکانی بەرهەمەکانی (ژاک دریدا). ئەو لەم وتارەدا ئاینی (ساتی)[56] هیندۆ دەخاتە ڕوو کە تیایدا دەبێ ژنی مێرد مردوو بچێتە ناو ئەو ئاگرەوە کە جەستەی هاوسەرەکەی دەسووتێنێ و ببێ بە قوربانی.

لە سەردەمی حکومەتی داگیرکەری بەریتانیادا ئاینی (ساتی) بە دەستووری دەسەڵاتدارانی حکومەتی کۆڵۆنیالی نایاسایی کرا. (سپیڤۆک) ڕەخنە لەم کارە دەگرێت و لافی ئەوە لێ دەدات کە ئەم مەسەلەیە ڕەنگدانەوەی خواستێکە بە داسەپاندنی بەهاکانی خۆرئاوا بەسەر کۆمەڵگای هینداو، کەواتە شێوەیەکە لە ئیمپریالیزمی کەلتوری. دەرئەنجام ئەوە بوو کە دەنگی ئەم ژنە ژێردەستانە نەبیسترا. دەسەڵاتدارانی حکومەتە کۆڵۆنیالیزمەکان نەیان ئەتوانی لە باوەڕی ئەو ژنانە تێبگەن کە (ئەوان) جێبەجێکردنی بەڵێنە ئاکاریەکەیان بە شێوەیەکی خۆپارێزانەوە ئەنجام دەدا. لە ڕاستیدا (سپیڤۆک) مەبەستی ئەوە نەبوو

کـە داکۆکـی لـە (سـاتی) بکـات، بـەڵکو مەبەسـتی ڕەخنـەگرتن بـوو لـەو ئینگلیزانـەی کـە تەسـەوریان دەکرد دەبێ بەهاکانیان وەك بەهاگـەلێکی جیـهانی لە قەڵەم بدرێ کە بەسـەر خـەڵکی تـەواوی جیـهاندا بـەراورد بکرێـت. ئـەو دەڵـێ مومکینـە ئـەم جـۆرە لافلێدانـە (جیـهانخوازی)یـە تەنـها دەرئـەنجامی جیهانبینییەکی تەواو (وتە تەوەری) بێت.

ئـەتوانین لـە تیـۆری (سـپیڤۆك)دا پـەیوەندی پۆست مۆدێرن لەتـەك "پلورالـیزمی کـەلتووری"دا ببینین کە لەو بڕوایەدان کەلتوورە جۆراوجۆرەکان، تەنها دەتوانـرێ بـە پێـی بـارودۆخی خۆیـان دەرك بکرێـــن و هەڵســـەنگێندرێن. بـــەم جـــۆرە (دژە بنـەماخوازی) لەتـەك (ڕێژەیـی خـوازی) فەرهـەنگی زێدەڕەویـدا تێکـەڵی یـەگدی دەبـن. بـە بـڕوای ڕەخنـەگران، لـەم پرۆسـەیەدا داکۆکیکـردن لـە مـافی مرۆڤ یان وەڵامدانەوەی تۆمەتی (ئەوروپا مەداری) کـاریکی مـەحال دەبیـت. پۆسـت مۆدیرنـی دژە بنەماخواز زەمینەگەلیکی ئاکاری ڕووبەڕووبوونەوە لەتـەك دیاردەکانی وەك ئەشکەنجەکردنی نـەیارانی سیاسـی لـە لایـەن سـەربازانی ئەفـەریقاوە، (منـال

کوشتن)[57] له (چین)دا و خەتەنەکردنی ژنان کە لە زۆر وڵاتی ئیسلامیدا باوەر، بیهیز دەکات

.(Kivisto 1994: 226-27, Callinicos 1989: 78-79)

سەرئەنجام، دەبێ بلیین کەلتوورەکان نابەردەوام و بەراوردنەکراو لەبەرچاو دەگیرین. هیچ زمانیکی هاوبەش نییە کە مۆلەت بە خەلکی بدات لە کەلتووره ناوچەییەکان و کورت بینییەکانی ئەوانە تێپەڕێنێت. بە واتایەکی تر، ئەگەر تیۆرسینەکانی پۆست مۆدێرن ڕاست بکەن، ئەوا ئێمە پێمان ناوەتە سەردەمێکەوە کە بە هۆی ئەو شتەوە دیاری دەکرێ کە (تۆدگیتلین)[58] یەکێك لە ڕەخنەگرانی پۆست مۆدێرن خەفەتبارانە بە "ئاوابوونی خەونە هاوبەشەکان" وەسفی دەکات.

کەواتە، کۆتاییهاتنی ڕیوایەتە گەورەکان نیشانەی بەتاڵبوون و کۆتاییهاتنی گەلاڵەی مۆدێرنەیە، لەگەڵ بڕوابوون بە وەی کە دەتوانرێ زانستی مرۆڤ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی سرووشت و جیهانی کۆمەڵایەتی بەکارببرێ و لەم ڕەوەندەشدا بۆ پشتگیری دروستکردنی





کۆمەڵگاگەلێکی ئینسانی تر و ڕەهاتر بکرێت. ئێمە بەو حاڵەتە دەگەین کە (دۆرکهایم) بە (ناهەنجاری فراوان) ناودێری کردووە.

## واقیعیەت و بان واقیعیەت لە کەلتووری (پۆست مۆدێرن)دا

لە کاتێکدا کە (مارکس) یان نەریتێك لە توێژینەوەی کۆمەڵناسی کە لە تێفکرینی (ئەوە) وە سەری هەڵدا سەرنجی بەسەر قەڵەمڕەوی بەرهەمهێناندا چڕ کردەوە (بۆ نموونە سیستمی کارگە و بارودۆخی بەرابەری چینی کرێکار) تیۆرسینە پۆست مۆدێرنەکان دیدگای خۆیان ئاڕاستەی قەڵەمڕەوی (مەسرەف) دەکرد. یەکێك لە لافلێدانە ئەسڵیەکانی پۆست مۆدێرنەکان لە گواستنەوەی کەلتووری مۆدێرنەوە بۆ پۆست مۆدێرن ئەوەیە کە دەبێ خەڵکی لە جیاتی بەرهەمهێنەر وەك (مەسرەف کەر) لەبەرچاو بگیرێن. جیا لەوانەش وا بیریان دەکردەوە کە لە کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا (یان بان

پیشەسازی) بە تەنها زۆربوونی کاڵاکان و ئەو خزمەتگوزاریانەی کە لە بەردەستان هەڵبژاردنگەلێکی مەسرەفی تەسەور نەکراو دەهێنێتە ئاراوە. (ژان فرانسوا لیوتارد)[59] (1979) ئەنوسێت:

تێکەڵاوخوازی پلەی سفری کەلتووری گشتی هاوچەرخە: مرۆڤ گوێ لە (ڕیگی)[60] دەگرێت، تەماشای فیلمی (وێسترن) دەکات، نیوەڕۆ خواردنی (ماکدۆناڵد) دەخوا و ئێوارەش خواردنی خۆماڵی، لە (تۆکیۆ) بۆنی پاریس لە خۆی ئەدا و لە (هۆنگ کۆنگ) جلوبەرگی (ڕیترۆ)[61] دەپۆشێت. زانست بابەتێکە کە پەیوەندی بە کایە تەلەفزیۆنییەکانەوە هەیە (ل–76).

### بۆدریلار، دەربارەی سەرمەشقی (دیسنی لەند):

بە زۆری، کەلتووری هاوچەرخ لە کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا کە لە ڕێگەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن، سەرگەرمی و سیستمە نوێکانی زانیارییەوە تێر بووە، وەسف دەکرێت. پرسیارەکە ئەوەیە کە ئاکامەکانی ئەم تێربوونە

چین؟ (ژان بودریلار)[62] (1981) مامۆستای پێشووی کۆمەڵناسی زانکۆی (نانتەر)[63] کە لە ڕابوردووی مارکسیستی خۆی دابڕا تا جێگای خۆی لە نێوان تیۆرسینەکانی پۆست مۆدێرنەدا پتەو بکات، بەم جۆرە ئیستدلالی کردووە کە ئەم تێربوونە بۆتە هۆی دروستبوونی جیهانێك کە تیایدا جیاوازی نێوان واقیعیەت و تەسەورەکان، نیشانەکان و وێکچوسازییەکانی واقیعیەت لەناو چووە. ئەم مەسەلەیە دەبێتە هۆی دروستبوونی ئەو شتەی کە (بۆدریلار) بە (وێنەگەلی خەیاڵ) ناودێری دەکات - واتە سەرلەنوێ بەرهەمهێنان یان وێکچوونسازییەکانی واقیعیەت کە دەستنیشانکردنی ئەوانە سەبارەت بە واقیعیەت دژوار یان مەحاڵە.

دەرەنجامی ئەوانە، سەرهەڵدانی شتێکە کە ئەو بە (بان واقیعیەت)[64] ناوی دەبات. ئەم زاراوەیە مانای شتێکە کە لە هەمان کاتدا کە واقیعی نییە، بەڵام واقعیترە لە واقعێك (Baudrillard 1983). (ستیڤن بێست)[65] و (دوگلاس کیلنەر)[66] (1991) ئەم نموونەیەی لای خوارەوە دەهێننەوە دەربارەی





ئەوەی کە مەبەستی (بۆدریلار) لە (بان واقیعیەت) چییە:

بۆ نموونە، هەندێ جار لە دونیای تەلەفزیۆندا لە بری پزیشکی واقیعی کەسیکی ئەکتەر بە خەیال وەك سەرمەشق لاسایی پزیشك دەکاتەوە. بەم جۆرە (رابەرت بانگ) کە رۆلی دکتۆر (ویلبی)[67] کایە دەکرد هەزاران نامەی پیگەیشت کە تیایاندا داوایان لیکردبوو رینمایی پزیشکیان بکات. ئەو دواتر لە رۆژنامەکاندا ئاگاداری بلاوکردەوە و لە بارەی پەرجووەکانی (قاوەی بی کافۆیین) خوینەرانی رینمایی دەکرد.

ئەم نموونەیە ئەوە دەردەخات کە چۆن (خەیال) بە شتیکی واقیعی لەبەرچاو دەگیریت– واتە تیکەل بە واقیعیەت دەبیَ و دەبن بە یەکیك. بەلام (بۆدریلار) دەلی کە دەورانی پۆست مۆدیرن بە دروستکردنی وێنەخەیاڵییەکان بەرجەستە دەبێت، واتە دونیا کۆمەلایەتییە (بان واقیعییەکان) کە پشت ئەستوور یان وابەستە بە (مەرجەعی) واقیعی نین. ئەگەرچی ئەتوانین نانخواردن لەناو ڕستۆرانە سەرپێییەکاندا، پارکە تایبەتییەکان و ناوەندەکانی





شت کرپینـدا بـە نموونەگـەلی وێنـا خەیاڵییـەکان بزانـین، بـەڵام بـە بـڕوای بۆدریـلار (1988) باشـترین نموونـە (دیسـنی لـەند)ە، چونکـە ئـەم سـەرزەمینە جادوییـە ئامـاژە بـە نوسـخەیەکی دووپـاتکراوە و ڕیوایەتێك لە (واقیعیەتی) دەرەوەی (دیسنی لـەند) ناکات.

ڕەنگـە ڕاڤـەکارە ناپۆست مۆدێرنـەکانی کـەلتور لەگـەڵ زۆرێك لـەو شـتانەی کـە بۆدریـلار تـا ئـێرە قسەی لەسـەرکردون هـاوڕابن، بـەڵام ئـەو دواتـر بـە "گشـــتگیربوون"ێکـــەوە ســـەرقاڵ دەبێـــت کـــە ڕووبـــەڕووی ڕەخنـــەی دەکاتـــەوە. ئەوکاتـــە ئـــەم خواستە بۆ (گشتگیر)ی بە باشی ئاشکرا دەبێ، کە بۆدریلار (1983) دەڵێ:

(دیسـنی لـەند) بە شێوەیەکی خـەیاڵی دروسـت کراوە تـا ناچارمان بکات باوەڕ بکـەین کە تـەواوی شوێنەکانی دی (واقیعین) لە کاتێکدا کە لە ڕاستیدا (لـــۆس ئـــەنجلس) و تـــەواوی ئەمـــەریکا کـــە چواردەوریان گرتووە، چیدی (واقیعی) نین، بەڵکو لە جۆری بان واقیعی وێکچووسازیدان. (لا25).

له یادمان نەچێت که (زیمیل) کاتی بێکاری به زەمینەیەکی گەلەك گرنگی ژیانی کۆمەلایەتی دەزانی، بەلام لەو بڕوایەدا بوو که چالاکییەکانی بێکاری جیاوازه له بواری مادی (کار).

بۆدریلار تەواو به پێچەوانەوه لەو بڕوایەدایه که ئەم جیاوازییه ئەمڕۆ شتێکی بێمانایه، چونکه ئەو جیهان تا ڕادەیەك به شێوەیەکی تەواو به پێی (مەسرەف) لەبەرچاو دەگرێت. بەم جۆره بۆدریلار (1983) به دابڕانی تەواو له ڕابوردووی مارکسیستی خۆی، دەڵێ:

ئێوه چیدی بێبەزەییانه له ژیانی ڕۆژانه جیانابنەوه تا جێگەی ئامێرەکانتان پێ بگرنەوه. بەڵکو له ڕاستیدا دەبن به یەك پارچه، مناڵیتان، عادەتەکانتان، پەیوەندییه ئینسانییەکانتان، غەریزەی ناهوشیاریتان (نەست)، تەنانەت ڕەتکردنەوەی کار له لایەن ئێوەوه.. بەهەرحاڵ هەرچۆنێك بێت هەرگیز به حاڵی خۆتان ڕەها نابن.. ئیدی کار له کار ترازاوه.. سیستمی کۆمەلایەتیبوون پێگەیشتووه. چیدی هێزی کار به شێوەیەکی توندوتیژ کڕین و فرۆشتنی پێ

ناکرێت، بەڵکو هێڵکاری، بازاڕ دۆزینەوە و مامەڵە دەکرێت. بەم جۆرە بەرهەمهێنان بە سیستەمی نیشانەکانی (مەسرەف)ەوە پەیوەست دەبێت. (لا 134).

دەستنیشانکردنی ئەوەی کە تێڕوانینی (بۆدریلار) لەسەر کەلتووری پۆست مۆدێرن چییە کارێکی ئاسان نییە.

(جیفری ئەلیسکەندەر)[68] (27: 1995) ئەو "بە ماموستای جوێنفرۆش و گاڵتەجاڕ ناودێر دەکات، لەوێدا کە تەواوی جیهانی خۆرئاوا دەگۆڕێ بە (دیسلنی لەند)". (ستورات هال)[69] لەو بڕوایەدایە کە (بۆدریلار) ستایشی پۆست مۆدێرنە دەکات، لە کاتێکدا (دوگلاس کیلنەر)[70] لە بەرهەمەکانیا خەفەتباری و قایلبوونی جەبری سیستەمی تازەی کۆمەڵایەتی دەبینێت کە گەرچی لە کابوسێکی زیاتر هیچی دی نییە،

.(Gane 1991: Smart 1992: 131)




(هەڵسەنگاندنە ناكۆكەكان لە چارەنووسی مۆدێرنیتەدا) تا ڕادەیەك دەستنیشانكردنی وێنایەك كە (بۆدریلار) لە ڕۆڵی تاكەكانی كەلتووری پۆست مۆدێرندا دەیكێشێت، ئاسانترە. وا دەردەكەوێت كە ڕۆڵی ئێمەی وەك ڕۆڵی ئەو مشكانە بچووك كردبێتەوە كە بە دوای شتە دڵخواز و (هەیەجانیەكانیاندا) دەگەڕێن، یان وەك ئەو كەسانەی كە سەیریتەلەفزیۆن دەكەن كە جگە لە پاڵدانەوە لەسەر قەنەفە و لە دوورەوە یاریكردن بە كۆنترۆڵی تەلەفزیۆنەكە، هیچ كارێكی دیكەیان نییە، یان وەك ئەو چاوچنۆكانەی كە لە ژیانی تایبەتی مرۆڤە دەولەمەند و بەناوبانگەكان وردئەبنەوە. پر ئاشكرایە كە ئیمە بە تەواوەتی لەناو دونیا كۆمەڵایەتییەكانی خۆماندا گرفتار بووین و ناتوانین كۆنترۆلیان بكەین، یان لە ڕاستیدا بە شیوەیەكی سەربەخۆكار بكەین.

لــە تــێڕوانینی (مــارکس)ەوە، دیدگــای گەمەکەرانی کۆمەڵایەتی گەلەك دوورە لە بە توانای بە زەبری ئەو گۆڕانە بە کەڵکەی کە لە کاری کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەم دیدگایە، پیشاندەری مەرگی تاکی (ئۆتۆنۆم)ە کە لە (دورکهایم)ەوە تا (بەلا) ناوەندی بایەخپێدانی قوتابخانەیەکی فیکری بووە. ئەم دیدگایە، لە هەڵسەنگاندنی بەدبینانەی (فیبەر)یش تێدەپەڕێنێت، چونکە (فیبەر) تا کۆتایی تەمەنی ئومێدەوار بوو کە خەڵکی دەتوانن بە شێوەگەلێکی باش لە بەرامبەر (قەفەسی ئاسنین)دا ڕابوەستن و سەرئەنجامی ئەوانە دیدگاکانی (بۆدریلار) بە ئاشکرا ناکۆکی هەیە لەگەڵ تێگەیشتنی (زیمیل)دا لە هەڵبژاردنی تاکەکاندا کە خەڵکی دەتوانن ئەنجامی بدەن. بە ڕووکەش پەیامی پاڵەکی (ضمنی) بۆدریلار ئەوەیە کە دەبێ ئێمە شەرمنانە بە کەرنەڤاڵی پۆست مۆدێرن قایل بین- و تەنانەت تا ئەو جێگەیەی کە دەتوانین چێژی لێ وەربگرین.

لێرەوەیە کە چیدی نیشانەکان ئاماژە بە مەرجەعە واقیعییەکان ناکەن و هەر لێرەشەوە کە





(واقیعیەت) بەرەو (بان واقیعیەت) دابەزیوە و مانا تەواو ون بووە. (بۆدریلار) (1991) لە نموونەیەکی تا ڕادەیەك بەرجەستەدا سەبارەت بە بەراوردی ئەم تێفکرینە بەسەر ڕووداوێکی دیاریکراودا، لافی ئەوە لێ دەدا کە جەنگی کەنداوی فارس جگە لە نمایشی گرافیکی کۆمپیوتەری و تەلەفزیۆنی، هیچی دی نەبوو– وادیارە جیاوازی لە نێوان ئەم جەنگە و یارییە جەنگییەکانی نمایشە ڤیدیۆییەکان بە تەواوەتی نەماوە.

هەر بەو شێوەیەی کە (داڤیدلیۆن)[71] (54: 1994) بە دروستی یادی دەکاتەوە. لە ڕاستیدا ئەم (واقیعیەت). کە "خێزانە لە خوێن گەوزاو و داخدارەکان" (و نەك بە شێوەی بان واقیعی) وجودیان هەبوو، لەم دیدگایەدا بزر بووە، هەر بەو جۆرە، لەم دیدگایەدا نیشانەیەك لە باوەڕبوون بە ئەرکی نیشتمانی، واقیعی جوگرافیا سیاسییەکان (ژئوپولتیك)، ئابووری نەوت و ئەو تێبینییە وێکچوانەی کە میللەتانی بۆ جەنگ هان ئەدا، بەرچاو ناکەوێت.

## ڕەخنەگرتن لە پۆست مۆدێرن

ڕەخنـــەی ئاشـــکرای بۆدریـــلار -لـــە تـــەواوی بەرهەمـــەکانیا– ئەوەیـە کـە واقیعیـەتێك هەیـە کـە خەڵکی تاقی دەکەنەوە و وەڵامی سۆزدار دەدەنەوە و هـەوڵ دەدەن شـکڵی پێبـدەن لـە دەرەوەی ژیـانی تەلـەفزیۆن و فـەزای پەیوەندییە ئەلکترۆنییـەکاندا . ئەو دونیا بێهەست و بێمانایەی کە لـەناو فیلمـەکان وەك (قەیفەی شین)[72]ی (داڤید لینـچ)[73] و چیرۆکی (شـــادی هێنـــەر)[74]ی (کوئنتـــین تـــارانتینو)[75]دا وێنـاکراون لەتـەك ئەزموونـەکانی واقیعـی ئێمـەدا هاوئاهەنگ نین و کەم کەس هەیە کە ئەم دوانە لێك جیا نەکاتەوە.

.(Bauman 1992, 149: 55, Best and Kellner 1991: 137-44)

ئاشـکرا کـە لـەم سـاڵانەی دواییـــدا دونیـــای (مەســـرەف) گۆڕانێکـــی زۆری بەســـەردا هـــاتووە و شیاوی ئەوەیە کە کۆمەڵناسی گەلەك زیاتر بایەخی پێ بدات، بەڵام ناتوانین بەڵگەگەلێکی وا سەبارەت بـەو لافلێدانـەمان بەدەسـتەوە بدەیـن کـە ئێمـە لـە کەلتووری مۆدێرنەوە پێمان ناوەتە ناو کەلتووری





پۆست مۆدێرنەوە، بۆ نموونە، پایەداری دەسەڵاتی باوەڕە مەزهەبییەکان، ئەو (بێمانایی)[76]یە بەربڵاوەی کە بۆدریلار وێنای دەکات، دووچاری گومان دەکات. بزاڤە تازەکانیش کە لەگەڵ هەندێ مەسەلەی وەك، ژینگە، ئاشتی، داکۆکیکردن لە مافی ژنان، مافە ژیارییەکان و هەژاری سەروکاریان هەیە، پێوەری بە ناچار هەڵاتن و (ئینفیعال)ی سیاسی کە خەڵکی لە کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا هەڵیان بژاردووە، دووچاری دوودڵی و گومان دەکات.

ئەم جۆرە پۆست مۆدێرنە بەو لافلێدانەیەوە کە ئێمە لە قۆناغی بەرهەم هێنانەوە چوینەتە ناو قۆناغی (مەسرەف)ەوە بەڵگەگەلێکی گرنگ لە هەبوونی خاڵێکی گەورە و گرنگ بە دەستەوە دەدات. ئاشکرایە کە کاڵاکانیش هەروەها بەرهەم دێن، ئەگەرچی ڕەنگە ئەمە لە ئابووری جیهانیدا بەو مانایە بێت کە کاڵاکان لە وڵاتە هەژارەکاندا بەرهەم دێن جێگایەك کە بە کرێکاران (بە زۆری منداڵان) حەقدەستێکی یەگجار کەم دەدەن و کەواتە ناچار دەبن چەندەها کاتژمێر بە کرێیەکی کەم لە

کارگـــە ناتەندروســـتییەکاندا کاربکـــەن. ئـــەو جلوبەرگانـــەی کـــە لـــە فرۆشـــگا گـــەورەکاندا دەفرۆشـــرێن و ئـــەو پێـــڵاوە وەرزشـــیانەی کـــە نـاودارانی وەك (سـپیایك ڵی)[77] لـە ئاگادارییـەکانی تەلـەفزیۆندا پێشکەشی دەکـەن، بـە بەرهـەمی ئـەو لایەنە تاریکەی کەلتووری هاوچەرخمان لە قەڵـەم دەدرێـت. جیـا لەوانـەش هـەر بـەو شـێوەیەی کـە (ئـەلیکس کالینیکوس)[78]. (162: 1989) وتویـەتی نـە تەنها خـەلکانیکی زۆر لـە جیـهاندا لـەو (مەسـرەف خـوازی)یـە ئاوارتـە بـوون کـە لیوتـارد و بۆدریـلار وەسـفی دەکـەن، بـەلکو خـەلکی هـەژاری کۆمـەلگا پیشەســازییە پیشــکەوتووەکانیش لـــەم جـــۆرە (مەسرەف)ە هیندە بەشدار نین.

### ئانتۆنی گیدنز و رۆژگاری مۆدیرنی دواهەمین

بـە لەبـەرچاوگرتنی ئـەو رەخنـە توندانـەی کـە پیشتر لیکۆلینەوەمان لەسەر کردن، جیـی خۆیـەتی کە بپرسین بۆچی تیۆری کەلتووری پۆست مۆدیرن ئەو جـۆرە کاریگەرییـەی لەسـەر هـەندێ لـە کـۆرە کۆمەلناسییەکان داناوە؟ یەکەم، وەلام ئەوەیـە کـە

پۆســـت مۆدیرنـــەکان تویژینـــەوەیان لەســـەر بارودۆخی کەلتووریکی تـازە کـردووە کـە تـا ئـەم دواییانـەش تیۆرسـینە مۆدیرنـەکان وەك پیویسـت بایـەخیان پـی نـەدابوو. دووهـەم، زۆریك لـە پۆسـت مۆدیرنـەکان لـە دەربرینـی هەلویسـتی توندرەوییـان سـەبارەت بـە دیدگـای کۆمەلناسـی، واتـە هەلویستەکانی (بۆدریلار) و خواستی فەلسەفی تر واتـە خواسـتی کەسـایەتییەکانی وەك (لیوتـارد و دریدا) پاشەکشەیان کردووە. هـەندێ لـە هزرمـەندە داهینـەرەکانی وەك، (فردریـك جیمسـن)[79] و (ئەرنسـتۆلاکلو)[80]، (چانتـال مـوف)[81] ناسـی فریـزەر[82]، هـەولیان داوە بـە شـیوەی هـەلبژاردن توخمـەکانی تیـۆری پۆسـت مۆدیـرن لەتـەك تیـۆرە جۆراوجۆرەکانی مۆدیرندا، تیکەل بە یەك بکەن. بە تایبەت ئەو تیۆرانەی لە مارکسیزم و فیمینیزمـەوە سەرچاوەیان گرتووە. لەگەل ئەوەشـدا، هـەر بـەو جـۆرە ئـەوان لەتـەك بـەردەوامی بـەکارهینانی زاراوەی پۆست مۆدیرن ئەم چەمکە ئەگویزنەوە کە لە کۆتاییدا دابرانیکی کـەلتووری بنچینـەیی رووی داوە یان لە دۆخی رووداندا دەبیت.





هەندێ لە تیۆرسینەکان (کە ئەبێ لەوانە ناوی یۆرگن هابرماس، ببەین) ڕەخنەیان لەم چەمکی دابڕانە بنچینەییە گرتووە. ئەتوانین هەندێك لەو ڕەخنانەی کە تەواو ڕازیمان ئەکات، لەناو کارەکانی تیۆرسێنی زانکۆی (کیمبریج) (ئانتۆنی گیدنز)دا، بدۆزینەوە. بە دوو بەڵگەی شایستە لەگەڵ (گیدنز)دا باسەکەمان سەبارەت بە بابەتە گرنگەکانی کۆمەڵ ناسی، کۆتایی دێنین. یەکەم، ئەوەی کە ئەو بە یەکێك لە باشترین -و ڕەنگە باشترین- توێژەرەوەی دەقە تیۆرییەکانی کۆمەڵناسی لە جیهانی ئەمڕۆدا ناسراوە. نووسینەکانی (گیدنز) (1995، 1978، 1979، 1971) سەبارەت بە تیۆرسینە کلاسیکەکانی کۆمەڵناسی و تیۆرسینە گەورە هاوچەرخەکان، بە هۆی ڕاشکاوی و لێبڕاوییەوە ناسراوە، و هەروەها بڕوای بەو بنەمایە کە تیۆرسینی کۆمەڵناسی هەم کەسێکی (جەدەلی)یە (واتە، لە کەموکورییە دیارەکانی بەرهەمەکانی ئەوانی دی ڕەخنە دەگرێت) و هەم تا ئەو جێگایە بە باشی ئەوە دەردەخات کە کەسێکی (ئیستدلالی)یە و کەڵك لە کارەکانی ئەوانی دی وەردەگرێت و پەرەیان





پێ دەدات (بۆ ڕاڤەکردنی باسێکی گشتی دەربارەی کێشەکان، بڕوانە Lybrand 1996). دووهەم، ئەوەیە کە (گیدنز) هۆشیارییەکی تەواومان پێ دەبەخشێت، چونکە ڕەنگە لە یادتان بێت کە ئەو یەکێکە لەو تیۆرسینانەی کە لە بەشی یەکەمدا قسەمان لەسەر کرد کە لە بەرامبەر ئەو ڕەخنانەی لە کۆمەڵناسییان دەگرت، سەرسەختانە داکۆکی دەکرد.

"گیدنز" ساڵی 1938 لە باکوری لەندەن لەدایک بووە.

لە یەکەمین ساڵەکانی خوێندنی لە خوێندنگادا خوێندکارێکی بەرجەستە نەبوو. کەواتە لە بری ئەوەی بچێتە ناو زانکۆ بەناوبانگەکانی وەك (ئاکسفۆرد) و (کیمبریج)، لە زانکۆی (هال) درێژەی دا بە خوێندن. لەبەرئەوەی کە نەیتوانی بواری زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزی بخوێنێت خواستی بنەڕەتی فەلسەفەی هەڵبژارد، بەڵام چونکە ژمارەی ئەو وانانەی کە لە بواری فەلسەفەدا ئەخوێنرا کەم بوو، وانەکانی کۆمەڵناسی و دەروونناسی هەڵبژارد.





بەم جۆرە پێدەچێت ئەم تیۆرسینە کۆمەڵایەتییە بەرجەستەیە ئەم بوارەی بە پێی ڕێکەوت هەڵبژاردووە. (گیدنز) بە خێرایی هۆگری زانستە کۆمەڵایەتییەکان بوو و ئەم خۆشەویستییەی کاریگەرییەکی پۆزەتیفی هەبوو بۆ سەرکەوتنی لە خوێندندا چونکە پلەی (مومتاز)ی لەو زانکۆیەدا وەرگرت.

پاشان (گیدنز) چووە کۆلێژی بەناوبانگی ئابووری زانکۆی لەندەن و لەوێش پلەی (ماجستێری) وەرگرت و پاش ئەوە بەکاری وانەوتنەوە لە زانکۆی (لیستر) سەرقاڵ بوو. لە کۆتایی دەیەی شەستەکاندا (ئەو) (لیستر)ی بەجێهێشت تا لە زانکۆی (سایمۆن فریزەری) کەنەدا وانە بڵێتەوە.

پاشان چوو بۆ وڵاتەیەکگرتووەکان و لە زانکۆی کالیفۆرنیادا (UCLA) خەریکی وانەوتنەوە بوو.

ڕووبەڕووبوونەوەی لە کالیفۆرنیای باشوور لە لوتکەی شۆڕشەکانی خوێندکاراندا لە دژی کەلتوور ئەزموونێکی سەرنجڕاکێشی هوشیارکەرەوە بوو. (براینت)[84] و (جێری)[85]





کاریگــەری ئــەو ڕووبەڕووبوونــەوەیان لەســەر چۆنییــەتی تــێڕوانینی "گیدنــز" ســەبارەت بــە کۆمەڵناسـی بـەم شـێوەیەی لای خـوارەوە وەسـف کردووە:

کۆمەڵناسە کۆنـە ئەوروپاییـەکان سـەبارەت بـە چین (طبقة) و دەسـەڵاتی گۆڕینـی ژیانی ڕۆژانـەی پەیوەست بە هیپییەکان و بزاوتـە کۆمەڵایەتیەیکان بۆ نموونە، بزاوتە خوێندکاریـەکان و بزاوتـی دژ بـە جەنگی ڤێتنام، تێڕوانینێکی لاوەکیان هـەبوو. ئـەو (گیدنـز" ئـەوە دەگێڕێتـەوە کـە چـۆن سـەفەر بـۆ (پـلاژی) کــە کەســانێکی زۆری بــە جلوبــەرگی سەرنجڕاکێشـەوە لێ بـوو، ئـەوەیان تێگـەیاند کـە کۆمەڵناسی ئەوروپایی و بەرنامـەی بزواتـی چـەپی ئــەوروپایی چوارچێوەگــەلێکی تایبــەت بــە خۆیان هەیە.

لە کۆتایی دەیەی پڕ ئاشوبی شەستدا (گیدنز) گەڕایەوە بۆ بەریتانیا و لەوێ هەم خولی دکتۆراکەی تـەواو کرد و هـەم لـە (کیمبریج)دا بـە وانەوتنـەوەی کۆمەڵناســی خــەریك بــوو. ســەرەڕای ســەرقاڵی بــەکاری فێرکــاری جۆراوجــۆرەوە لــە زانکــۆ

بیانییەکاندا بۆ نموونە، خولی وانەوتنەوە لە زانکۆی کالیفۆرنیا و سانتاباربارا، هەروەها گەڕانەوەی بۆ کەنارەکانی کالیفۆڕنیای باکوور و پاش هەموو ئەمانە لە (کمیمبریج)دا مایەوە.

## تیۆری بنیادگەری

(گیدنز) سەبارەت بە تەواوی ئەم بابەتانەی کە لەم کتێبەدا قسەمان لەسەر کردن، نووسینێکی زۆری هەیە. ئەو دەربارەی تێگەیشتنی خۆی لەسەر مێردنە لە کتێبی "بونیادی چینایەتی کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکان"[86]. (Giddens 1973) هەوڵی داوە جیاوازی و وێکچوونی شێوەبەندی چینایەتی کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکان لەتەك کۆمەڵگای پیشەسازی پێشوودا کە (مارکس) شرۆڤەی کردوون دەربخات. لەو کتێبەدا ئەو ڕەخنە لە تیۆرسینەکانی بان پیشەسازی وەك (بیل)[87] و (تورین)[88] دەگرێت کە پەیوەندی بنەڕەتی کۆمەڵگا پیشەسازی و بان پیشەسازییەکانیان بە خەیاڵ ئەزانی، بە

پێچەوانــەوە (گیدنــز) ســەبارەت بــە پــەیوەندی مێژوویی ئەم کۆمەڵگایانە ئیستددلالی ئەوە دەکات کە بە تەواوی گۆڕان ڕووی داوە بەڵام ئەو پێی وایە کـە وا باشـترە لـە بـری کۆمـەڵگای بـان پیشەسـازی (فراصنعتـی) قسـە لەسـەر کۆمـەڵگای پشەسـازی پێشکەوتوو بکـەین. هـەر بـەو شێوەیە دەبینـین کـە ئـەویش ئیســتدلالێکی وێکچــووی لــە بەرامبــەر لافلێدانەکانی پۆست مۆدێرنەکاندا هەیە.

بەر لە باسکردنی گەڵاڵەی تایبـەتی ئـەو شتەی کـە (گیدنـز) بـە (بـان مۆدێرنیـت)ە یـان (دەورانـی مۆدێرنـی دواهـەمین) نـاودێری دەکـات، دەبـێ ئـەم بەرهەمـە گرێ بدرێت بـە هـەوڵ و تەقـەلای گشـتی (ئــەو)ەوە بــۆ لایــەنگری دووبــارەی لــە تیــۆری کۆمەڵناسـی. (گیدنـز) وتوویـەتی کـە لـە تـەواوی ژیانیا لە هەوڵی هێنانەکایەی تیۆرێکدا بووە کە بە (تیــۆری بونیادگــەریی) نــاوی دەبــات، بــەڵام هەوڵــەکانی بــۆ تیــۆری ســازی زیــاتر لــەم دوو بەرهەمەیدا بەرچاو دەکەوێت: کتێبی (دەستوورە تازەکانی ڕەوشی کۆمەڵناسی)[90] (1976، ناونیشانی کتێبەکــە وەڵامێکــی ئاشــکرایە بــۆ بەرهەمــە

پێشـووەکەی دۆرکـهایم واتـه دەسـتووری ڕەوشـی کۆمەڵناسـی کـه لـه سـاڵی 1938دا بڵاوکرایـەوە) و گرنگتریش لەوە، (بونیادی کۆمەڵگا)[91]یه (1948).

کتێبـی دووهـەم، بـه گـەورەترین دەسـکەوتی (گیدنـزه) لـه تیۆریسـازیدا. (گیدنـز) بـەو دەستەواژەیه قـایل دەبێ کـه بـه زۆری لـه کتێبـی (هەژدەهـەمی برومـر)ی مارکسـدا (1996 [1852]) دەیگێڕنەوە که خەڵکی خۆیان جیهانی کۆمەڵایەتی دەخوڵقێنن. ئـەو پێـی وایـه کـه کێشـەی بنـەڕەتی ڕووبەڕووبوونەوەی تیۆری کۆمەڵایەتی دەرخستنی پێوەنـدی گونجـاوی نێـوان گەمەکـەران و بونیـادە کۆمەڵایەتییەکانـه. تیـۆری بونیادگـەری تەقەلایەکـه بۆ زاڵبوون بەسەر (دووفاقی بیرکردنەوە)دا کـه ئـەو پێـی وایـه بـه بـەردەوامی دامێنگـیری تیۆرەکـانی دیکـەش بـووە– ئـەو دووفـاقی بیرکردنەوەیـەی کـه یـان شـەقڵێك بـه گەمەکـەران یـان بـه بونیـادە کۆمەڵایەتییـەکان دەدات. ئەگـەرچی جۆرەکـانی کۆمەڵناسـی ڕاڤـەکاری بـۆ نموونـه کـرداری بەرامبـەری هێمـایی (کنـش متقـابل نمـادی) گرایشێکی زۆری هەیه سەبارەت بە زیانگەیاندن بە

بونیاد لـە بەرامبـەر (فاعلیـەت)دا، بـەڵام لـە تیـۆرە جۆراوجۆرەکـانی بونیادگـەراییدا، بـۆ نموونـە لـە شـێوەکانی پارسـۆنی و مارکسیسـتی نوێـدا پێچەوانەی ئەمە بە ڕاست دادەنرێ (Giddens 1984, Cohen 1989).

کورتکردنـەوەی تیـۆری بونیادگـەرایی، بـە بـێ لەبەرچاوگرتنی خواستی بەردەوامی (گیدنز) و ئەو سـەرچاوە جۆراوجـۆرە تیۆرییانـەی کـە کـەڵکیان لێوەردەگرێ، کارێکی مەحاڵە.

لە ڕوانگـەی ئێمـەوە گەلـەك گرنگـە بایـەخ بـەو خاڵە بدەین کە ڕێگاچارەی پێشنیازی (گیدنز) بۆ کێشەی (گەمەکەر-بونیاد)[92] بە چڕبوونـەوە بەسـەر شێوەی کـردەوە کۆمەڵایەتییـەکاندا بەدەسـت دێ. ئـەو بـە قـازانجی ئـەو شـتەی کـە بـە "دووفـاقی بونیـاد)[93] ناوزەدی دەکات ئیستدلالی ئەوە دەکات کە بەم واتایە هەم بونیادەکان بە دەستی گەمەکەرە مرۆییـەکان بەدەست دێ و هـەم ئامرازێکە کـە ئـەم جۆرە کردارە بە یارمـەتی ئـەو پێکدێت بونیادەکان لە لایەن مرۆڤەکانەوە دروست دەکرێن. بەڵام ئەوانە





هـەم کرداریـــی مرۆیـــی سـنووردار دەکـــەن و هـــەم توانای پیٚ دەبەخشن.

Giddens 1984, 1976, Lewert 1995: 146-56, Graib 1992:)
.(33-72

بایــەخی ئــەم دیدگایـــە بـــە هـــۆی یارمەتییـــە بنەڕەتییەکانی ئەوەوە بۆ تێگەیشتنمان لە مۆدێرنە ئەوەیە کە لـەم تیۆرەیدا دیدگایەك شاراوەتەوە کە دەتوانین ئەو (دیدگا)یە بە هاندەری خۆشبینییەکی (تـــەقریبی) لەبـــەرچاو بگریـــن- دیدگایـــەك کـــە تەسـلیمی ئـەو ئەنجامگیرییـە بەدبینانەیـە نـابێت سـەبارەت بـە بێـهێزی گۆڕینـی ژیـانی مۆدێـرن بـە ئاراستەیەکی باشتردا.

کەواتـە، گەمەکـەران بێـهێز نـابن و لـە ڕێنمـایی کـردن و فۆرمۆڵــەکردن و بــەڕێوەبردنی هێزەکــانی مۆدێرنیتـەدا -بە شێوەی تاك یان کۆمـەڵ- ڕۆڵــی خۆیـــان دەگـــێڕن. لەگـــەڵ ئەوەشـــدا مۆدێرنیتـــە هێزێکی وێرانکەری بێبەزەییە کە ناچارین لە تەکیا بڕۆین: هەلومەرجمان بەو جۆرە نییە کە بتوانین بـە ئـیرادەی خۆمـان لیٚ دەربچـین یـان لێــی تێپــەڕێنین .(Giddens 1990: 151)

## ئاكامەكانى مۆدێرنیته

(گیدنــز) لــەم (ســێ)[95] بەرهەمــەیدا كــە لــە ســەرەتاى دەیــەى نــەوەدا بلاوكرانــەوە تیــۆرە بونیادگەراكەى بۆ توێژینەوە سەبارەت بە لایەنە جۆراوجۆرەكانى مۆدێرنە خستەگەڕ و هەروەها بە لێكۆڵینــەوەى پەیوەندییــەكان لــە ڕابوردوویــەكى نزیــك و لایەنگــەلێك لــە ژیــانى كۆمەڵایــەتى (هاوچەرخ)دا خەریكبوو كە، ئەوە دەربخات ئێمە چوینەتە ناو قۆناغ یان سەردەمێكى تازە لە مۆدێرنە كە ئەو (گیدنز) بە (مۆدێرنەى دواهەمین) یان (بان مۆدێرنە) ناوزەدى دەكات. بە گشتى ئەم كارانــە وەڵامێكــى پاڵــەكى (ضمنــى)یــە بــۆ پرسیارەكەى (لاتۆر)[96] كە لە سەرەتاى ئەم بەشەدا خرایە ڕوو. وەڵامى (گیدنز) ئەوەیە كە ئێمە (لە ڕاســتیدا مۆدێرنــین، و ماوەگــەلێكى زۆرە بــەم جۆرەیــن و بــە ڕووكــەش تــا ئایندەیــەكى پێشبینیكراو هەر بەو جۆرە دەمێننەوە.

(گیدنـز) لـە یەکـەمین و (ڕێکوپێکـترین)ی ئـەم کتێبانـەدا واتـە (ئاکامـەکانی مۆدێرنیـت)[97]ە (1990) ئیستدلالی ئەوە دەکات کە مۆدێرنە لەژێر کاریگەری دووفاقی دەوڵەتی نەتەوەیی گەشەکردووی مۆدێرن و سیستمی پیشەسازی خـوازی سـەرمایەداری لـە خۆرئاوادا هاتە ئاراوە.

تـا ڕادەیـەك، مۆدێرنـە لـە مـاوەی ئـەو مێـژووە کورتـەیدا بـوو بـە دیاردەیـەکی جیـهانی و کـەم کـەم چووە ناو کەلتوورە ناخۆرئاواییەکانی سەرتاسەری جیهانەوە.

جیـهانی مۆدێـرن لـەو دەوڵەتـە نەتەوەییانـە پێکهاتووە کە ڕۆڵێکی سەرەکیان لە تایبـەتیکردنی نیازمـەندی سـەرچاوەکانی کۆمـەڵگادا هەیـە. چڕبوونەوەی دەسەڵات لە دەوڵەتدا هێزی سەربازی دەوڵـەت زیـاد دەکـات و بـە شـێوەیەکی بـەرفراوان توانـای کۆنـترۆڵکردنی ئیـداری هاووڵاتیـانی پـێ دەبەخشـێت. دەوڵەتـە نەتەوەییـەکان کۆمـەکێکی گرنگ بە دروستبوونی کۆمەڵگای زانیاری مۆدێرن دەکەن، چونکە ئەم دامەزراوە ڕێگا بۆ شێوەکانی چاودێریکردن و کۆنترۆڵی تازە و بـەرفراوان خۆش





دەکـــات. جیـــا لەمـــەش، دەوڵـــەتی نەتـــەوەیی پەیوەندییەکی نزیکی لەگـەڵ ئـابوری پیشەسـازی سەرمایەداریدا هەیە. سەرمایەداری ئاماژە دەکات بـە سیسـتمی بەرهەمـهێنانی گەلـەك ڕکابـەرئامێز لەتەك ئەو بازاڕی کارانەی کە بە پێوەری جیهانی کاردەکەن، لە کاتێکدا کە لای (گیدنز) لە بنەڕەتدا (پیشەســازیخوازی) بــە مانــای بــەکارهێنانی تەکنەلۆژیای ئامێرییە بۆ کۆنـترۆڵکردن و گۆڕانـی سرووشت و دروستکردنی "ژینگەی خولقاو"ە.

بە گشـتی ئەوانە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییـەکان و پەیوەندی مرۆڤیان لە تەك سروشتدا بە قووڵی گۆڕیوە.

مۆدێرنـە ئـەو پرۆسـەیەی لێ دەکەوێتـەوە کـە (گیدنز) (19: 1991) بە مەودای هەڵبژاردن ناوی دەبات بەو مانایەی کە چیدی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان بـــە شـــوێنە تایبەتییەکانـــەوە وابەســـتە نـــین و، پەیوەندیکردن بە کەسانێکەوە کە ئامادەیی فیزیکیان نییـە لـە ڕادەبـەدەر ئـەبێ بـە تایبەتمـەندی جیـهانی مۆدێـرن. بـە تـەواوی تێگەیشـتنی ئـەم دیاردەیـە لـە ئاگادارییـە سەرنجڕاکێشـەکەی کۆمپانیـای (AT and T)دا (دەسـتدرێژ بکـە و، دەسـتی کەسـێك بگـرە). بـە





ئاشکرا دەردەکەوێ. لە توێژنیەوەکانی ئەم دواییەدا. ئـەم دیاردەیـە تیۆرامـانێکی قوڵـتری لەسـەر کـرا سەبارەت بەو پەیوەندییـە واقعیانـەی کـە لـە کـەش و هەوای پەیوەندییە ئەلکترۆنییەکاندا بەرقەرار دەبن.

هـەروەها، مۆدێرنیتـە ئـەو پرۆسـە وابەسـتەیەی ناسراوە بە (نـهێنی سـڕینەوە) دەگرێتـەوە (Giddens 1990: 21: 27). ئەم پرۆسەیە بریتییە لـە (دەرچوون)ی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە زەمینە ناوچەییەکانی کـرداری بەرامبـەر و نوێکردنـەوەیان لـە پانتـایی ناسنورداری (کات– شوێن)دا. (گیدنز) وەك (زیمیـل) جۆری سەرەکی (نهێنی سڕینەوە)ی لە فراوانبوونـی ئـابووری پـارەیی (دراوی)دا دەبینێـت. لـە هـەندێ رووەوە ئەو وەك دورکـهایم جـۆری دووهـەمی (نـهێنی سڕینەوە)ی لەو پشتیوانییە زۆرەی کارناسە پیشەیی و (فـەنی)یـەکاندا دەبینـی. لـە هـەردوو جۆرەکـەدا پێویستە تاکەکان بە متمانەی تەواوە ڕەفتار بکەن کە گیدنز (244 :1991) ئەوانە بە "متمانەکردن بە تاکـەکان یـان سیسـتمگەلی ئەبسـتراکت کـە لەسـەر بناغـەی (کەمتەرخەمی) ئـەنجام دەدرێ و دەرخـەری نـەزانی و ناهۆشیاری"یە پێناسە دەکات. چۆن متمانە بەرقەرار





دەبێ و دەپارێزرێت؟ چ شتانێك متمانە کەم دەکەنەوە؟ (گیدنز) ئەم پرسیارانە لە باسەکانی کۆمەڵگای مۆدێرنی دواهەمیندا، وەك کۆمەڵگایەکی مەترسی هەڵگر (خطر پزیر) بە مەسەلەگەلێکی بنەڕەتی و چارەسەرنەکراو دەزانێت.

## ئەگەری مەترسی لە مۆدێرنەی دواهەمیندا

(گیدنز) چوار ئەگەر (احتمال)ی مەترسی دەستنیشان دەکات کە لە چوارچێوەی ئەم دەزگا سیاسی– ئابوورییەدا حەشار دراوە بیروڕای گیدنز دەربارەی ئەگەری مەترسییەکان و مزگێنییەکانی ئایندەی مۆدێرنیتەی دواهەمین).

| ئەگەری مەترسییەکان | مزگێنییەکانی ئاینده |
|---|---|
| خەملێنی دەسەڵاتی تۆتالیتر | بەشداریکردنی دیموکراتیکی چەندلایەنە |
| جەنگی ئەتۆمی یان جەنگە بەرفراوانەکان | نەمانی جەنگ |
| دابەزینی میکانیزمەکانی خەملێنی ئابووری | ئابووری بان دەگمەنی (ناوێزەیی) |
| کارەساتی ژینگە | سیستمی چاودێری جیهانی |

یەکەمین ئەگەری مەترسی زۆربوونی توانای خاوەن دەسەلاتەکانە لە چاودێریکردنی بەسەر قازانجی کۆنترۆڵی زانیارییەکان و چاودێریکردنی خەڵکیدا. هەر لێرەوە کە لەم سالانەی دواییدا تواناکانی چاودێریکردنی دەوڵەت و دامەزراوە سەرمایەدارییەکان بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیان کردووە، ئەم توانایییە ئەگەری مەترسی خەملێنی تۆتالیتر دەهێنێتە ئاراوە.

دووهەمین ئەگەری مەترسی زیادبوونی خێرای دەسەلاتی سەربازییە کە لەگەڵ (پیشەسازیبوونی جەنگ)دا هاتۆتە ئاراوە، دیاردەیەك کە لەتەك جەنگی جیهانی یەکەمدا دەستی پێکرد و پیشاندەری کۆتایی "جەنگە سنووردارەکان" و سەرەتای دەورەی تەوارەکان"ە. پەرەسەندنی چەکە بە کۆمەڵکوژەکان وەك چەکە ئەتۆمییەکان هەندێ مەترسییان ڕووبەڕووی مانەوەی مرۆڤ کردووە کە تا ئەمرۆ کەس وێنای نەکردووە لە سەدەی بیستەمدا زیاتر لە هەموو سەدەکانی تر کوشتن و بڕینی لێکەوتۆتەوە، (بۆ نموونە، ژمارەی





قوربانییانی شەڕ لە سەدەی بیستەمدا، بە لانی کەمەوە، پانزدە ئەوەندەی سەدەی نۆزدەهەم)ە.

سێهەمین ئەگەری مەترسی پەیوەندی بە ڕووخانی بە زەبری سیستمەکانی گەشەکردنی ئابوورییەوە هەیە. ئەم ئەگەری مەترسییە پەیوەندی بە ئەگەری مەترسی چوارهەمەوە هەیە کە هەمان شێمانەی بە زەبری نابووتبوون یان کارەساتی ئۆکۆلۆژییە.

باوەڕە سیاسییەکانی (گیدنز) لایەنگیری لە باڵی چەپ دەکات و بەم جۆرە جێی سەرسوڕمان نییە کە دەڵی دەبێ سیستمی سەرمایەداری ڕێکبخرێت تا "تایبەتمەندییە پێشبینی نەکراوەکان" یان بەو جۆرەی کە مارکسیستەکان دەڵێن (خواستگەلی قەیران)ی خۆیان، چاك بکەن. هەر بەو جۆرە ئەو لەو بڕوایەدایە کە سەرمایەداری مۆدێرن لە ئاستی نەتەوەیی و جیهانیدا نابەرابەرییەکی خراپ دەخاتەوە.

"گیدنز" جیا لەم مەسەلانە و بە تێپەڕبوون لە مارکسیزم ئیستدلالی ئەوە دەکات کە نیازی سەرمایەداری لە پەرەپێدانی هەمیشەیی توانای





بەرهەمـــهێنانیدا ڕووبـــەڕووی چوارچێوەكـــانی (ئۆكۆلــۆژی) دەبێتــەوە و بــەم جــۆرە پــەیگیری كەڵەكـەكردنی سـەرمایەدارانە یەكێكـە لـە هۆكـارە سەرەكییەكانی نابووتكردنی ژینگە

(Giddens 1990: 163 هەروەها بڕوانە Beck 1992).

بە كورتـی ئـەم ئەگـەری مەترسییانە بە ئاشـكرا لایەنە تاریكەكەی بـارودۆخی مۆدێرنـی دواهـەمین دەردەخەن و بەڕووكەش جدیبوونی ئـەم هەڕەشانە پاساو بۆ بەدبینییەك دەهێننەوە كە وێكچووی ئـەو شتەیە كە زۆرێـك لـە پۆسـت مۆدێرنـەكان دەریـان بڕیوە. (گیدنز) (1990) كتێبی (ئاكامەكانی مۆدێرنە) بـەم پێشـبینییە خەفـەت هێنــەرەی لای خــوارەوە، كۆتایی دێنێت:

لە دیوێكی دیكەی مۆدێرنەدا لەو جێگایەدا كە ئیدی هیچ كەس بە كردەوە لەسەر ئەم گۆی زەوییە نـاتوانێت هۆشـیار نــەبێت، هیــچ شــتێ جگــە لــە "كۆماری جڕوجانەوەرەكان و ئاڵف" یان كۆمـەڵێك یـان مومكین نییـە، كۆمـەڵێك لـە ئەنجومـەنی مرۆڤـە زیـان لێكەوتووەكان بونیـان هــەبێت.. ئاپۆكـالیپس Apocalypse كــــۆن بـــــووە و وەك پێچەوانـــــەی





ڕاستییەکانی ژیانی ڕۆژانە هەمووان لێی بە ئاگان، لەگەڵ ئەوەشدا وەك تەواوی توخمەکانی مەترسی ئیحتیمالی، ڕەنگە ببێتە شتێکی ڕاستەقینە (ل 173).

بەم حاڵەشەوە، (گیدنز) تەسلیمی بەدینی نابێت، چونکە ئەم مەترسیانە بە شتانێکی بەزەبر دەزانێ نەك شتانێکی حەتمی. بە دڵنیاییەوە دەکرێ بەرگری لە بەدیهاتنی ئەم سیناریۆ تۆقێنەرە بکرێ و هەروەها ڕێگاچارەی بۆ ئەگەری ئەم چوار مەترسییە بدۆزرێتەوە. بە تایبەت (گیدنز" لەناو ئەو بزواتە ئەگەرییە جۆراوجۆرانەی کە لایەنگرییان بە (واقیعخوازی یۆتۆپیایی) دەزانێ، هەندێ نیشانەی مژدەبەخش دەبینێت.

بزاوتی کرێکاری (بزاوتێك کە لە یەکەمین قۆناغەکانی کۆمەڵگای پیشەسازیدا دەرکەوت) هەوڵ دەدات خواستەکانی مەترسی ئەگەری سەرمایەداری چاك بکات، لە کاتێکدا کە بزاوتە دیموکراتییەکان ڕووبەڕووی دەسەڵاتخوازی دەبنەوە، بزواتەکانی ئاشتی ڕووبەڕووی میلیتاریست دەبنەوە و، بزواتەکانی ژینگە هەوڵ





دەدەن ئەو مەترسیانە لەناو ببەن کە هەڕەشە لە ژینگەی جیهانی دەکەن. ئەگەرچی سەرکەوتنی ئەم بزاوتانە دەستەبەر ناکرێت. هەر بەو شێوەیەش ناتوانین تێکشکاندنیان دەستەبەر بکەین. ئەو شتەی بۆ پێویستی مانەوەی ئەم بزاوتانە گرنگە تێڕوانینێکە کە بە "واقیعخوازی یۆتۆپیایی" قایل دەبێت.

## مۆدێرنیتە، ئەزموونێکی زیندوو

**Lived experience**

(گیدنز) لەو دوو کتێبەدا کە دوای کتێبی ئاکامەکان (1990) بڵاوکرانەوە واتە (مۆدێرنیتە و شوناسی خود)[98] (1991) بڵاونەکراوە واتە (مۆدێرنیتە و شوناسی خود)[98] (1991) و (گۆڕانی پەیوەندییە نزیکەکان)[96] (1992)، ڕووی کردە هەندێ بابەت کە جێگەی بایەخی (زیمیل) بوو - ئەوەی کە خەڵکی چۆن بارودۆخی مۆدێرن ئەزموون دەکەن. ئەو هەوڵ دەدات پەیوەندییە بەرفراوانەکانی نێوان وەرگۆڕانە جیهانییەکان و ئەو گۆڕانکارییانە پیشان بدات کە لە پێکهێنانی





شوناسەکان و پایەداری پەیوەندی نێوان تاکیدا (میان فردی)، ڕوودەدات.

(خود) دەگۆڕێ بە گەڵاڵەیەك کە دەبێ دروست بکرێت، نەك شتێك کە نەریت یان عادەت بە شێوەیەکی یەگجاری دەستنیشانی کردبێت.

ئەم گەڵاڵەیە شیمانەی گومانێکی بەرچاو و هەرەشەی هەستی پوچی (نهلیزم) لە تەك خۆیدا دەهێنێت. بەڵام هەر بەو جۆرە شیمانەی بەرنامەدانانی ژیانیش -هەڵبژاردنی شێوەی ژیان- بە تاکەکان دەبەخشێت. لە کاتێکدا کە هەندێ لە ڕەخنەگرانی کتێبەکانی (دەستووری کۆمەك بەخۆکردن)، و (بەرنامەگەلی دوانزە قۆناغی)و شتانی وەك ئەوانە، لەم بەدواچوونەی شێوەی ژیاندا جۆرێك لە خۆ-شەیدابوون هاوچەرخدا ئەبینن (گیدنز) هەڵسەنگاندنێکی ئیجابی (پۆزەتیف) تری هەیە. ئەو (گیدنز) ئەم ڕەوەندە بە پێی دەرکەوتنی "سیاسەتی ژیان"[(100)] وەسف دەکات کە پەیوەندی هەیە لە تەك ئازادی تاك بۆ هەڵبژاردن و خستنەڕووی وەڵامگەلێك بەو پرسیارە (وجود)یەی کە تاك دەبێ چۆن بژی؟ بە





واتایەکی دی، سیاسەتی ژیان بە سەرکەوتنی (خۆ پێگەیاندن)ی تاك لە قەڵەم دەدرێ (Giddens 1991: 2.9-31).

سیاسەتی ژیان، ئاکامگەلیکی هەمەلایەنەی بۆ پەیوەندییەکانی (نێوان تاك) و بە تایبەتی پەیوەندییە نزیکەکانی هەیە.

دیموکراتیزەبوونی پەیوەندییە نزیکەکان و بەدواداچوونی (خۆپێگەیاندن)ی سۆزداری، پەیوەندییە نزیکەکانی گۆڕیوە و شێمانەی پایەداربوونی "پەیوەندییە بێخەوشەکانی" لە دەورەی مۆدێرنی دواهەمیندا هێناوەتە ئاراوە، کە پەیوەندیگەلێکن تەنها بە پێی بارودۆخی دەروونی خۆیان نەك بە پێی هۆکارە دەرەکییەکان دەستنیشان و پێناسە دەکرێن.

(گیدنز) (3: 1992) لافی ئەوە لێ دەدات کە "رەنگە گۆڕانی پەیوەندییە نزیکەکان بە شێوەیەکی گشتی کاریگەرییەکی وێرانکەرییان لەسەر دەزگا مۆدێرنەکان، هەبێت". بەلەرچاوگرتنی ئەو راستییەی کە رەوەندی ئەندیشەی ئەو تا ئێستاش لە بەرەوپێشچووندایە،





کەچی گەلەك بابەت ئاشکرا نین سەبارەت بەوەی کە ئەم گۆرانە مومیکنە چ شتانیك لە دەرەوەی قەلەمرەوی پەیوەندییە نزیکەکان لەخۆ بگریت.

لەگەل ئەوەشدا، ئاشکرایە کە سەردەمی مۆدیرن سەردەمیکە کە لەتەك سەرلەنوێ بیرکردنەوەدا دیاری دەکریت، واتە سەردەمیك کە هەمیشە تیایدا کردار و باوەرەکانمان تاوتوی دەکریت. (گیدنز) بەشیکە لە ئەنجوومەنی گوتاری کۆمەلناسی -کۆمەلناسانی رابورد و ئەمرۆ- کە رۆلیکی گرنگی لە چالاکی بەردەوامی تویژینەوە و سەرلەنوێ بیرکردنەوەی بارودۆخی مرۆڤدا لە جیهانی هاوچەرخدا هەبووە و هەر بەو جۆرەش دەبیت.

**سەرچاوە:**

(اندیشەهای بنیادی درجامعە شناسی)/ پیتەر کریستو- ترجمە/ منوچر حیدری. سال 1378 تهران.

## زنجیرە کتێبی گیرفانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

| ناوی کتێب | نوسینی | وەرگێڕانی |
|---|---|---|
| 1-ژن لە شیعرو ژیانی مندا | نزار قەبانی | جەمال غەمبار |
| 2-نیچە | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| 3-سوڕی مانگانەی ژن | مارتن لۆدڤیك | ئەکرەم قەرەداغی |
| 4-دیکارت | پۆڵ ستراتێرن | ڕەئوف بێگەرد |
| 5-بیری ئاینی کۆن لە میزۆپۆتامیادا | د. تەقی دەباغ | یاسین عومەر |
| 6-ڕێبازەکانی ڕەخنەی ئەدەبی | دیاینی. دەچز. ئبرامز | عەتا قەرەداخی |
| 7-ئاین و کەسایەتی | ل. پاڵس | ئاوات ئەحمەد |
| 8-هەشت نامە | گۆنتەرگراس-کینزابۆرۆئۆ | شوڕش جوانڕۆیی |
| 9-ئانارشیزم | د. مستەفا ڕەحیمی | ڕێباز مستەفا |
| 10-کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد | ئارچی ڕۆزفڵت | ئەکرەم قەرەداخی |
| 11-دەربارەی دیالێکتیکی.. | موراد فەرهاد پوور | بەختیار سەجادی |
| 12-پۆزش | ئەفلاتون | ئاوات ئەحمەد |
| 13-ئاوابوونی هزرە تۆباوییەکان | ئایزایا بەرلین | کامیل محەمەد |
| 14-هونەری نیگارکێشان.... | شمیدت دیجینەر | وەهبی ڕەسوڵ |
| 15-چامەی پەخشان | سۆزان بیرنار | سەلاح محەمەد |
| 16- ئاین، عەلمانییەت ، ... | محەمەد ئەرکۆن | شوان ئەحمەد |
| 17- سارتەر | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| 18-چۆن دەبیت بەباشترین هاوڕێی خۆت | میلدرید نیومان بێرنارد بێرکۆتس | شێرزاد حەسەن |
| 19-کوردو زمانی کوردی | تۆفیق وەهبی | عەزیز گەردی |
| 20-ئەنتۆنین ئارتۆو شانۆی . | جلال ستاری | پێشڕەو حسێن |
| 21-پاسکاڵ | ئاندرێ کریسۆن | سامان عەلی |
| 22-کافکا | سادقیهیدایەت یوسف حاجی میرزای | محەمەد کەریم |
| 23-لەنێوان بلیمەتیو شێتیدا | هاشم ساڵح | نەوزاد ئەحمەد |
| 24- مرۆڤ لە ڕوانگەی فرۆیدەوە | قاسم حسێن ساڵح | عەبدولموتەلیب عەبدوللا |





25–جیهانی ئیمپریشێنیزم — هانز خافێ — ئیسماعیل حەمەئەمین و حەمەی ئەحمد رەسول

26–لە"نیویۆرك"ەوەتا"كابول" — یوسف ئەبازەری و موراد فەرهاد پوور — مەنسوور تەیفووری و فەرهاد ئەمین پوور

27–مۆدێرنە و ڕاسیزم — جۆرج تەرابیشی — شوان ئەحمەد

28–پاش بونیادگەری — تێری ئیگلتۆن — سەلاح حەسەن

29–فەلسەفەی خۆراوایی — ئاوات ئەحمەد





